کۆماری عێـراق
وەزارەی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن
دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
کتێبی ژمارە ( ٢٨٤ )

محمدی مەلاکریم

# بیری کۆمەڵایەتی و سیاسی پیرەمێرد

## لە کەلێنی «بێ یەسی تەمسیلێکی ڕاستی تەئریخی»یەوە «لە وڵاتی خۆماندا ڕوویداوە»

لەگەڵ تێکستی

## بێ یەسی تەمسیلێکی ڕاستی تەئریخی لە وڵاتی خۆماندا ڕوویداوە

لە نووسینی : پیرەمێردو ،
ساغکردنەوەو پەراوێزبۆکردنو ڕابەربۆنووسینی محمدی مەلاکریم

چاپخانەی ( دار الحریە ) لە بەغدا
١٩٩٢

**پێشکەشە :**

بە گیانی پاکی هەموو ئەوانەی :
بە بیر ، بە دەس ، بە قەڵەم ، بە ژیان ، بە مەرگ ..
خاکی پاکی کوردستانو گەلی سەربەرزی کوردیان ،
هەنگاوێ پتر ، لە ئازادیو بەختەوەرییەوە نزیک
خستووەتەوە .

# بیری کۆمەلایەتی و سیاسیی پیرەمێرد

## لە کرلێنی «بی یەسی تەسیلێکی ڕاستی تەئریخی»یەوە «لە وڵاتی خۆماندا ڕوویداوە»

لەوانەیە ڕۆشنبیرانی نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەمان زۆر کەسی وایان تیابێ ئەوەندەی پیرەمێرد لە مەیدانی جۆربەجۆری ڕۆشنبیریدا کاری کردبێ ؛ بەلام لەوە دلنیام کە کەم کەسیان تیایە ئەوەندەی ئەو واقیع بینانە ڕێگای گەشەکردنی کۆمەلەی کوردو گەیشتنەوەی بە کاروانی مرۆڤایەتیی پێشکەوتوودای دەسنیشان کردبێ ، بێ ئەوەیش لەگەل گرۆو کەسانی سەر بە قوتابخانەی جیاجیای خەباتی سیاسیو ڕۆشنبیریو کۆمەلایەتی بکەوێتە مشتومڕو دەستەویەخە بێتەوە • پیرەمێرد ، لەگەل قەناعەتی چەسپاوی ناو دلو دەروونی خۆیشیا کە ڕێگای ڕاست کامەیە ، بە متمانەی تەواوەوە ، لەو باوەڕەدا بووە ئەبێ لێگەڕێین هەر لایێ چۆنی بە باش ئەزانێ وا بۆخۆی بیربکاتەوەو وا تێبکۆشێو ، ڕۆژگاری داهاتوو ئەوەمان بۆ دەستەبەر ئەکا کە سەرەنجام ، درەنگ یا زوو ، کەم یا زۆر ، هەر لایێ بۆی دەرکەوێ کام بیر ڕاسترەو ، کام ڕێگا باشتر بە ئەنجاممان ئەگەیەنێ •

من لەئەنجامی وردبوونەوەمەوە لە هەندێ نووسینی پیرەمێرد بەم ئەنجامە گەیشتووم و ، لامۆایە ئەگەر بەرهەمی پیرەمێردمان بە ڕێکخراوی و کۆکراوەیی لە بەردەستا بووایە ، توانای گەیشتن بەم ئەنجامەمان بە

دوورودرێژی‌و بە لێکدانەوەی هەموو ڕوویەکی مەسەلەکەو ، لە گەلێ ڕووترو لەمێژترەوە لە دەسەلاتا ئەبوو ، جا ئەوکاتە نەئەکەوتینە ژێر باری ئەو هەنە سەنگینانەوە کە سالەهایەکی دوورودرێژ بەشێکی زۆر لە ڕۆشنبیران‌و نیشتمانپەروەرانی لەلەلەمان لەبارەی پیرەمێردەوە تێی‌کەوتبوون‌و ، ڕوالەتەکەی سادەکاری‌یەکی زەق‌وزۆپ بوو لە جۆری بیرکردنەوەماناو ، ڕێگرتن لە دەربڕینی ئیجتیهاداتی جۆی‌جۆیٚ لە هەلوێستا بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ گیروگرفتە کۆمەلایەتی‌و سیاسی‌یەکانمان‌و ، چەسپاندنی تاقە یەك شێوەی مامەلەکردن‌و هەلسەنگاندن بەسەر تێکڕای بزووتنەوەی نەتەوەیی‌و نیشتمانیماناو ، بەدیکردنی تەنها دوو ڕەنگی ڕەش‌و سپی بوو لە هەموو ئەم جیهانە پڕ لە ڕەنگوڕووی هەمەجۆرەدا .

من چەند سالە ئەو خەیالە لە سەرما پەروەردەئەکەم کە بۆم بلوێ هەموو ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامانە بخەمە بەردەستم کە پیرەمێرد بەدرێژایی ماوەی ڕۆژنامەچی‌یەتی‌کردنی لە سلێمانی دەریکردوون یا تیا نووسیون‌و ، بیرو تاقیکردنەوەو دەرزی ژیانی خۆی‌و دەوروبەری لە شێوەی وتارو پارچە شیعرو پەندی چوارینەو سەرەمەقەستو شانۆنامەو پارچە پەخشان‌و شتی‌وادا بۆ تیا داڕشتووین‌و ، مەشقی ژیانی پێ کردووین‌و پیشانی داوین ئێمەی کوردی لە بارو دۆخێکی لە زۆر ڕوودوە تایبەتی‌و بێ‌هاوتادا ژیاو چۆن ئەتوانین بە ئامانجی خۆمان بگەین . بەئاواتەوەم بتوانم سالێ دوو سالی ژیانی خۆم تەرخان بکەم بۆ پیاچوونەوەی سەرلەبەری ئەو ڕۆژنامانەو گشت بابەتەکانیان بە جیاجیا بنووسمەوەو پاشان بابەتبەندی‌یان بکەم‌و بەشی هەر بابەتێ لە کتێبێکی سەربەخۆداو بە پێشەکی‌یەکی تێروتەسەلەوە بخەمە بەردەستی خوێندەوارانی کورد . گەلێ‌جاریش هەولم بۆ ئەم مەبەستە داوە ، بەلام ، بەداخەوە ، تائێستا

ئاوانەکەم نەهاتووەتەدیو ، لە ڕۆژی ئەمڕۆدا لە وەزعێکی وادا ناژیم بەئاسانی دەستم بگاتە ئەو ڕۆژنامانەو ، ئەرکەکەیش هەروا ماوەتەوە چاوەڕوانی کەسێکی لێهاتووە شانی بداتەبەرو خۆی پێوە خەریك بکاو بەجێی بگەیەنێ . هیوام وایە وەك چۆن بەرتی یەکەمی تێکڕای دیوانەکەی پیرەمێرد بەشێوەیەکی گەلێ لە جاری یەکەمی پوختتر بڵاوبووەوە ، ئەم ئەرکە پڕبایەخەیش کەسێکی بۆ هەڵکەوێ کارامانەو بەدڵسۆزییەوە شانی بداتەبەرو لەعۆدەی بەئەنجامگەیاندنی بێ ، چونکە بێ ئەمە لێکۆڵینەوەی ڕاستەقینەی بیری پیرەمێرد نایەتەدیو ، لێکۆڵینەوەی بیری پیرەمێردیش لێکۆڵینەوەی لایەکی پڕبایەخی ژیانی ڕۆشنبیریی نوێی گەلی کوردەو ، تەنانەت لەپاش مردنی پیرەمێردەوە تا ئەمڕۆو بەدرێژایی ئەم لە چل ساڵ پترە کەسێکی وا لەناو ڕۆشنبیرانی کوردا هەڵنەکەوتووە کەلێنی دۆجکردنیسان بۆ پڕبکاتەوەو . ئەمە بۆخۆی شایەتی مەزنیی ئەو دەورەیە پیرەمێرد لە ژیانی ڕۆشنبیریماندا گێڕاویەتی .

ئەم هەڵسەنگاندنەی من بۆ پیرەمێرد ، بەمجۆرە پڕبایەخە ، لەوێوە سەرهەڵئەدا کەوا ئەم پیاوەم وەك ڕۆشنبیرێکی ئەوتۆی گەلەکەمان دێتە پێش‌چاو بەشێکی زۆری - ئەگەر نەیشڵێم هەمووی - سەرخالی بیناى کۆمەڵایەتیی کوردەواریی بە بیرو بۆچوونە واقیع بینالەکانی خۆی گرتووەتەوە . من ، پیرەمێرد بە ڕۆشنبیرێکیی وای کورد ئەزانم بەش‌بەحالی ئەو قۆناغەی تیا ژیاوە ، ئەگەر زۆرتری ڕۆشنبیرانو سیاسەتمەدارانی کورد ، هەر لە سەرەتاوە ، یا هیچ نەبێ لە هەندێ هەڵکەوتی گەورەی مێژوویییەوە ، لەم یا لەو پارچە لە پارچەکانی کوردستانا ، شوێن‌پێی قوتابخانەی بیریی ئەویان هەڵبگرتایەو بەوپێیە بجووڵانایەتەوە ، تائێستاو لە ڕێگایەکی هێندیو کەمەینەترو واقیعی ناوخۆو دەوروبەری نزیكو دوور بەدیکردووانەترەوە ، گەلێ لە ئێستا

زیاترو زووتر بۆپێشەوە ڕۆیشتبووین‌و ، زۆر لە پێویستی‌یەکانی ئەم قۆناغەی ژیانی کوردەواریمان دەستەبەر کردبوو .

* * *

چەند ساڵێ لەمەوپێش بەبۆنەی یادی کۆچی دوایی پیرەمێردەوە وتارێکم بە ناوونیشانی « گەڵاڵەی پرۆژەیەك بۆ لێکۆڵینەوەی پیرەمێرد » بڵاوکردەوە[1] ، لەو وتارەدا نووسیبووم : « وەك ئەزانین پیرەمێرد بیروباوەڕی خۆی لە چوارچێوەی هیچ کتێبێکدا نەنووسیوەتەوە » . هەرچەند لەو وتارەدا وەك سەرچاوەیەك بۆ دەستنیشانکردنی بیروباوەڕی پیرەمێرد ، بایەخێکی زۆرم بە ڕۆژنامەو بە شیعرەکانی پیرەمێرد داوە ، ئەبێ ئێستا دانی پیا بنێم ئەو حوکمە موتڵەقەی ئەوڕۆژەم حوکمێکی نادروست بوو ، چونکە هەر هیچ نەبێ «پێ‌یەسی تەمسیلێکی ڕاستی تەئریخی لە وڵاتی خۆماندا ڕوویداوە» کە کاکەی فەللاح ناوی لێ‌ناوە : «مەحموودئاغای شێوەکەڵ[2]»و ، پیرەمێرد خۆی ، وەك باوە ، جارێ لە ڕۆژنامەی (ژین)و ، جارێکیش لە شێوەی کتێبدا[3] بڵاوی‌کردووەتەوەو ، وای وەسپ ئەکا کە «ئەم تەمسیلە چەند دەرسی تیایە»و لە چوارچێوەی باسی ئەو دەرزانەدا بیرە مەبەستەکانی یەکالا ئەکاتەوەو ، بە چەند دێڕێك

---

(1) بڕوانەرە : محمدی مەلاکریم ، گەڵاڵەی پرۆژەیەك بۆ لێکۆڵینەوەی پیرەمێرد ، هاوکاری ، ژمارە ٦٤٢ ، ١٩٨٢/٦/١٧ ، ل ٦ .

(2) بڕوانەرە : پیرەمێرد ، مەحموودئاغای شێوەکەڵ ، پیەسی تەمسیلیەکی ڕاستی تەئریخی لە وڵاتی خۆماندا ڕوویداوە ، لەسەر ئەرکی کاکەی فەللاح چاپ کراوەتەوە ، چاپی دووەم ، ١٩٨٥ ، سلێمانی ، چاپخانەی کاکەی‌فەللاح ، چاپخانەی نەورەس .

(3) بڕوانەرە : پیەسی تمثیلیکی راستی تاریخی لە ولاتی خوماندا رویداوە ، پیرەمرد نوسیویەو لە چاپخانەی خویدا ، لە سلیمانی لەچاپی‌داوە ، نسخەی (٣٠) فلس ، ١٣٦١ هـ ، ١٩٤٢م .

کۆمەڵی بیروباوەڕی خەستی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو سیاسی ئەخاتەڕوو ـ ئەم پی‌یەسە بەئاشکرا بۆمانی دەرئەخا کە نەئەبوو پێش بەسەرکردنەوەی هەموو بەرهەمەکانی پیرەمێردو دلنیابوون لەوە کە بیروباوەڕی لە چوارچێوەی هیچ کتێبێکا نەخستووەتەڕوو ، ئەو حوکمە موتلەقە ناڕاستە بدەم[4] .

کە پاشان بەهۆی دۆستی خوالێخۆشبووم کاکەی فەللاحەوە نوسخەیەکی دەسنووسی ئەو شانۆنامەیەم[5] دەسگیر بوو بۆ دۆستی دووروڵاتم عەبدوللا پەشێوی شاعیری بنێرم کە ئەو کاتە قوتابیی دوکتۆرای ئەدەبی کوردی بوو لە مۆسکۆ ، بەرلەوەی بۆ ئەوی بنێرم خۆم خوێندمەوەو ، کە لە بایەخی زۆری حاڵی بووم فۆتۆیەکم لەبەرگرتەوەو ناردم بۆ عەبدوللاو دەسنووسەکەم لای خۆم هێشتەوە . لە دڵی خۆما بڕیارمدا لە هەلێکا لەگەڵ پێشەکییەکا لەچاپی بدەمەوە . بەلام متمانەی

(4) لاموایە هەر بەمەبەستی هەڵسەنگاندنی ئەم حوکمە موتلەقە نادروستەی منیش بووە کاکەی فەللاح لە پێشەکیی چاپی دووەمی ئەم شانۆنامەیەدا نووسیویە : « زۆر جار ، چ بە نووسین ، چ بە لێدوانی لێوان نووسەرانو ڕۆشنبیران ، چەند بیرو ڕایەك دەکەونە بەرچاوو گوێمان ، کە گوایە بیروباوەڕی پیرەمێرد زۆر ئاشکراو ڕوون نی‌یەو ، لە دووتوێی بەرهەمەکانیدا ئەو بیروباوەڕانە ناکەونە بەرچاو . بەلام بەلای منەوە کە چەشنە هەڵوکەوتو نزیکی‌یەکی دوورو درێژم لەگەڵ بەرهەمەکانیدا هەیە ، حەزدەکەم ئەوە بڵێم کە بیروباوەڕو بۆچوونی لە سەرانسەری چوار بەرگی پەندەکانو دیوانەکەیو ئەم چیرۆکەیدا [ مەبەستی شانۆنامەی «پیەسی تمثیلیکی راستی تاریخی لە ولاتی خوماندا رویداوە»یە ـ م ] بەئاشکرا دیارە ، بەجۆرێکی ئەوتۆ کە جێگای مشتومڕو لێدوان نی‌یە » . بڕوانەرە : پەراوێزی ژمارە ٢ ، ل ٣ .

(5) ئەم دەسنووسە لە ٣٢ لاپەڕەی دەفتەرا لەلایەن (ظاهر) ناوێکەوە نووسراوەتەوەو ؛ لە ١٩٨٢/٤/٢٥دا لە نووسینی بووەتەوە .

نەواوم بە دەستنووسەکە نەبوو ، گەلێ هەڵەم تیا دەستنیشان کردبوو . بیستبوویشم کە پیرەمێرد خۆی لە ڕۆژنامەی (ژین)داو پاشانیش بە کتێب بڵاوی کردووەتەوە . لەبەر ئەوە هەر بەدوای نوسخەیەکی ڕۆژنامەکە یا کتێبەکەدا ئەگەڕام ، بەڵام لە هەرکوێ بۆی ئەگەڕام نەئەگەیشتمە ئەنجامو بە دەستی خاڵی ئەگەڕامەوە[٦] .

لە ١٩٨٥دا کاکەی فەلاح چاپێکی دووەمی شانۆنامەکەی بە پێشەکییەکەوە بڵاوکردەوە[٧] . بە بەراوردکردنی ئەم چاپەی کاکەی فەللاح لەگەڵ دەستنووسەکەی پێشتر بۆی ناردبووم ، بۆم دەرکەوت هەرچەند هەندێ لە هەڵەکانی دەستنووسەکەی تیا ڕاست کردووەتەوە ، هەندێکیان هەر ماون . کاکەی فەللاح لەبارەی ئەو نوسخەی شانۆنامەکەوە کە چاپەکەی خۆیی لەڕوو ئامادەکردووە هیچ ئیشارەتێکی نەکردووەو لەوە پاتری نەوتووە کە پیرەمێرد « لە ساڵی ١٩٤٢دا بڵاوی کردووەتەوە[٨] » .

---

(٦) تا ئەوکاتە هەر لە کتێبخانەی هەموانی سلێمانی کۆمەڵەی ڕۆژنامەی (ژیان)و (ژین)م دەسگیر بوو ، ئەبینم لە کۆمەڵەی ساڵی ١٩٤٢ی ڕۆژنامەکەدا چەند ژمارەیەك ناتەواوەو لە هیچکام لە ژمارەکانی‌تریا هیچ بەشێکی شانۆنامەکەم نەدییەوە . بە خەیاڵی خۆم وتم لەوانەیە کەسێك کارێکی بەو ژمارە ناتەواوانەی ڕۆژنامەکە بووبێ‌و بردبنی بۆ خۆی‌و ، ئەو ژمارانەی شانۆنامەکەیان تیا بڵاوکراوەتەوە لەناو ئەو ژمارە نەوتاوانەدا بن . کتێبەکەیشم هەروا لە هیچ کتێبخانەیەکا دەسگیر نەبوو ، تەنانەت لە دوو بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی‌یشا کە تا ئەوکاتە لە عێراق دەرچووبوون ناوی ئەم کتێبە نەبوو [ بڕوانەرە : نەریمان ، کتێبخانەی کوردی ، کەرکوك ، چاپخانەی شارەوانی ؛ ١٩٦٠ ؛ نەریمان « مستەفا سەیدئەحمەد » ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، ١٧٨٧ — ١٩٧٥ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٧ ] .

(٧) بڕوانەرە : پەراوێزی ژمارە ٢ .

(٨) بڕوانەرە : سەرچاوەی پێشوو ؛ ل ٣ .

لەم ڕووەوە لە کاکەم پرسی ، ئاگاداری کردم کەوا ئەویش نوسخە چاپەکەی شانۆنامەکەی نەدیوەو وەختی خۆی تەنها ژمارەیەکی ڕۆژنامەی (ژین)ی بەرچاو کەوتووە کە بەشێك لە شانۆنامەکەی تیا بلاوکراوەتەوەو لەبەرئەوە کتێبەکەی لەڕووی نوسخەیەکی دەستنووس لەچاپداوە کە نوسخەیەکیشی لێ ناردبوو بۆ منو ، ئەو دەستنووسەیش هەڵەی زۆری تیا بووە بە بۆچوونی خۆی هەندێکی لێ ڕاست کردوونەتەوەو ، هێشتایش هەڵەیوای تیا ماوە بۆی ڕاستنەکراوەتەوە .

بە بلاوبوونەوەی چاپەکەی کاکەی فەللاح نیازەکەی من ئەوەندەی تر ئەگەرەی هاتەڕێ ، چونکە مادەم کاکەی فەللاح چاپێکی ، با بێکەموکووڕییش نەبێ ، بلاو کردەوەو ، لەولایشەوە نوسخەی چاپەکەی پیرەمێرد خۆی یا دەستنووسێکی خۆی بەدەستەوە نییە ، با منیش لامواێ ئەتوانم تێکستی دەستنووسەکە لە کاکە چاکتر ڕاستبکەمەوە ، هێشتا هەر بەڵگەیەکی پەسەند بەدەستەوە نابێ بۆ پێویستیی بلاوکردنەوەی چاپێکی نوێتر . لەبەرئەوە دەسبەرداری نیازەکەی خۆم بوومو لێی گەڕام بۆ ڕۆژێ کە نوسخەیەکی پشتپێبەستراوم دەسگیر ئەبێ .

* * *

لەسەرەتای ١٩٩٠دا دەزگای ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی بەغدا بڕیاریدا بەبۆنەی یادی چل ساڵەی کۆچی دوایی پیرەمێردەوە کۆڕێکی بەربلاو لە سلێمانی بگێڕێ . منیش یەکێ بووم لەوانەی دەزگای ناوبراو بۆ بەشداری لەو کۆڕەدای بانگکردبوون . نیازی بەستنی ئەو کۆڕەم بە دەرفەتێکی لەبار زانی بۆ ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی «پیەسی تەمسیلێکی ڕاستی تەئریخی لە ولاتیخۆماندا ڕوویداوە»وە . زۆر بەوە خۆشحاڵ بووم کەوا بۆمئەلوێ ئەم ئەسەرە مێژوویی و هونەریو کۆمەلایەتییەی پیرەمێردی مەزن بەسەربکەمەوەو ، لە کەلێنیەوە لە بیرو

بۆچوونی ئەو ڕۆشنبیرە گەورەی کورد لە هەندێ بابەتی ڕەکەفوکولی ژیانی دوردەواریدا بکۆڵمەوە .

ئەم وتارە کەوا ئێستا لەگەڵ تێکستی شاتۆنامەکەی پیرەمێردا ، بە هەندێ وردە دەسکاریێوە لە دووتوێی ئەم کتێبەدا بڵاوکراوەتەوە ، ئەو بابەتەیە کە بۆ ئەو کۆڕەم ئامادەکردو ، لە کۆبوونەوەی تاقی ئێوارەی ۱۹۹۰/٦/۱۹دا لە هۆڵی ڕۆشنبیریی جەماوەری سلێمانی پێشکەشی گوێگرانی ئامادەبووی کۆڕەکەم کرد .

لێرەدا بە پێویستی ئەزانم خوێندەوارانی خۆشەویست لەم خاڵانەی خوارەوە ئاگادار بکەم :

(۱) ئەو پارچانەی شاتۆنامەکەی پیرەمێرد کە لەم وتارەدا بەکارم‌هێناون ، لەڕووی تێکستە دەستنووسەکەی بەردەستمم نووسیونەتەوە کە پێشتر لێی‌دوام‌و ، لەگەڵ چاپەکەی کاکەی فەلاح بەراوردم کردوون ، سەرەڕای ئەو هەڵانەی کە بە بۆچوونی خۆم ڕاستم‌کردوونەتەوەو ، تەنها پاش خوێندنەوەی وتارەکە لە کۆڕەکەدا ، با ماوەیەك ، کە بە ڕەنج‌و تەقەلای برای ئازیزم یاسینی شێخ قادری بەرزنجەیی نوسخەیەکی چاپەکەی پیرەمێردی شاتۆنامەکەم بەر دەست کەوت [۹] توانیم بەراوردێکی وردیان لەگەڵ ئەو نوسخەیە بکەم‌و هەموو هەڵەکانیا ڕاست‌بکەمەوە .

---

(۹) نوسخەی ناوبراو یەکێکە لە کتێبەکانی کتێبخانەی ڕۆشنبیر خوالێخۆشبووی کورد عەبدوللا جەوهەر کە لەپاش کۆچی دوایی کردنی دراوە بە کتێبخانەی مەرکەزیی هەموان لە سلێمانی‌و ئێستە لەوێ پارێزراوەو ژمارەی گشتیی ۹٦٦و تەسەلسولی ٦٦و سینف (کوردی ع.ج)ە . لێرەدا ئەبێ سوپاسی زۆرم بۆ کاك یاسین‌و گشت کاربەدەستانی کتێبخانەی هەموانی سلێمانی بنووسم کە دەرفەتی ئەوەیان بۆ ڕەخساندم ئەو کتێبە ببینم‌و فۆتۆیەکی لێ بگرمەوە .

(٢) وەك لە تەماشاكردنی تێكستی شانۆنامەكەوە دەرئەكەوێ ، لام‌وایە چاپەكەی پیرەمێرد خۆیشی هەندێ هەڵەی زەقی تێكەوتووە كە هەندێكیانم بە بۆچوونی خۆم ڕاست‌كردووەتەوەو لە پەراوێزا ئیشارەتم بۆ كردوونو ، هەندێكی كەم‌بایەخیشیانم پشت‌گوێ خستووە . بە دووریشی نازانم هەندێكیان هەڵەی چاپ نەبن‌و پیرەمێرد خۆی وای نووسیبێ كە من لام‌وایە نابێ وا بووترێ . بە هەرحاڵ لەگەڵ ئەوەیشا كە پیرەمێرد كوردی‌یەكی زۆر ڕەوانی نووسیوە ، گەشەنەكردنی تەواوی كوردی نووسینی ئەو سەردەمەی ئەو مەیدانی ئەوەمان ئەدا بڵێین بنووسانی ئەو ڕۆژانەمان نەیانتوانیوە كوردی‌یەكی لەڕووی گراماتیكاوە بەتەواوی بێ‌هەڵە بنووسن . ئەوانەی ئەمڕۆ خۆیان بە ڕاستكردنەوەی هەڵەی نووسینی كوردی‌یەوە خەریك ئەكەن ، ئەتوانن بەئاسانی بەڵگەی ئەم قسەیەم لە نووسینی زۆر لە بنووسانی ومچە یەكەمەكانیشماڵا بەدی‌بكەن ، وەك لە نووسینی ومچەكانی هاوچەرخماڵایشای بەدی‌ئەكەن[١٠] .

(٣) هەرچەند پیرەمێرد كارە ئەدەبی‌یە سیاسی ـ كۆمەڵایەتی‌یەكەی خۆی بە (پی‌یەس) واتە (شانۆنامە) وەسپ‌كردووە[١١] ، بەتەواوی مەرجە هونەری‌یەكانی شانۆنامە نووسینی تیا ڕەچاو نەكردووەو لە زۆر شوێنیا وەك چیرۆك‌نووس مامەڵەی لەگەڵ كردووە . من لەم كارەمدا بەر لە هەرچی ئەوەم ڕەچاو كردووە كە تێكستەكەی پیرەمێرد بێ‌هەڵەو بێ‌دەسكاری‌یەكی كەس‌پێ‌نەزانیو بخەمە بەرچاوی خوێندەواران ، چونكە ، وەك كاكەی فەللاح لە سەرەتای چاپەكەی خۆیا نووسیویە ، «بەدەگمەن نووسەرانو

---

١٠) بۆنموونە بڕوانەرە : مەلا عەبدوللای زێوەر ، گەنجینەی مەردانو یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری ، محمدی مەلاكریم هێناونیەتە سەر شێوەنووسینی نوێ‌و پێشەكی‌و پەراوێزی بۆ نووسیون ، چاپخانەی ( شركة مطبعة الاديب البغدادية ) ، بەغدا ، ١٩٨٥ .

١١) بڕوانەرە : پەراوێزی ژمارە ٣ ، لاپەڕە ١ .

ڕۆشنبیرانی کورد دیویانە[12]»و ، هەر هیچ نەبێ وەچەی ئەمڕۆمان ئەگەر چاپەکەی کاکەی فەلـلاح نەبوایە مەگەر هەر بە بیستن باسی ئەم شانۆنامەیەیان بەرگوێ کەوتایە • لەبەرئەوە لەڕووی ئامادە کردنی شانۆیی‌یەوە هیچ دەسکاری‌یەکی تێکستەکەم نەکردووە • هیوامهوایە ئێستا تیە شانۆیی‌یەکانمان بیر لە پیشاندانی ئەم شانۆنامەیە بکەنەوەو بەرلەوەیش یەکێ لە شانۆنامەنووسە کارامەکانمان تێکستەکە بخاتە قالبی شانۆنامەیەکی بەتەواوی ئامادەی پیشاندانەوە •

* * *

پیرەمێرد شانۆنامەکەی بەمجۆرە وەسپ کردووە کە «پێ‌یەسی تەمسیلێکی ڕاستی تەئریخی »یە «لە ولاتی خۆماندا ڕوویداوە» •

پێش دەستپێکردنی تێکستی شانۆنامەکەیش ، بەمجۆرەی بە خوێنەواران ناساندووە :

« ئەم تەمسیلە چەند دەرسی تیایە :

١ ـ عەدالەت‌و ڕەعیەت نەوازیی مەحموودئاغا نەیهێشتبوو ئیجارەدارو زۆردار دەست بکێشنە مسکێن • ئەوانیش گیالی خۆیان بۆ بەخت ئەکرد •

٢ ـ خوێندەواری لەو بەردە ڕەقەی شیوەکەڵو سیاگوێزد چ‌دەماغێکی بە مەحموودئاغاو پەریچیهرە دابوو •

٣ ـ مەسرەفی بێهوودەو هەوایی جلەبووکو شایی •

٤ ـ کچ کە بە ئارەزووی خۆی بدرێ بە شوو ، ماڵو مێردی خۆی لا شیرینە •

---

(١٢) بڕوانەرد : پەراوێزی ژمارە ٢ ، ل ٢ .

٥ ـ حەسوودیو فیتنەجۆیی قەومێك دەربارەی یەكتری ، چ ئەوعە پیاوێكیان لەكیس ئەدا •

٦ ـ حوكوومەتێك كە فەرقو تەرجیحی عونسوریی كرد ، ڕوو لە نەهاتیی‌یە» •

ئەمە پوختەیەكی هەندێ لەو بابەتانەیە پیرەمێرد لە شانۆنامەكەیا مینا ونیەتە ئاراوەو ویستوویەتی لەم سەرەتایەدا جەختیان لەسەر بكا • لە هەمانكاتا نیشانەی ئەوەیشە كە شانۆنامەكەی بە مەبەستێكی سیاسی نووسیوەو ئاگاداری ئەو ڕاستی‌یەیش بووە كە شانۆ دەورێكی چەند كاریگەر لە پێشخستنی گەلو بەئامانج گەیاندنیا ئەبینێ • بەڵام وەنەبێ پیرەمێرد لەم شانۆنامەیا تەنها لەم بابەتانە دوابێ • ئەو گەلێ بابەتی پڕبایەخی‌وای‌تریشی تیا خستووەتەڕوو هیی‌وایان تیایە ، بە بۆچوونی من ، گەلێ لەو بابەتانەیش لەپێشترن • من بە دووری نازانم پیرەمێرد بە مەبەستی ڕەچاوكردنی بارو دۆخی سیاسیی ولاتو بۆ خۆ دوورگرتن لە ورووژاندنی هەندێ كۆڕو كۆمەڵو نەكەوتنە گێرەوكێشە لەگەڵیان ، ئەو جۆرە بابەتانەی بە زەقی لە ڕیزی دەرزەكانی تەمسیلەكەدا دانەنابێ‌و ، كورتی تەنها لەسەر ئەو شەش بابەتە هەڵهێنابێ كە باسی‌كردوون •

هەرچۆن بێ‌و ، پیرەمێرد لەبەر هەرچی تەنها ئەو شەش دەرزەی دەسنیشان كردبێ ، من لەم لێكۆڵینەوەما خۆم بە بابەتبەندی‌یەكانی ئەوەوە نەبەستووەتەوەو ، چ بابەتێكم بزیاتر بە شایانی لێدوان زانیبێ لێی‌دواوم[١٣]و ، ئومێدەوارم توانیبێتم دەورێ لە ناساندنی پتری بیری پیرەمێردا بە ڕۆڵەكانی گەلەكەی ببینم •

---

(١٣) وەنەبێ ، وەك بەڵگە بۆ هەر هەڵسەنگاندنێك لەم وتارەدا ، بڕگەیەكم لە تێكستی شانۆنامەكە هێنابێتەوە . خوێنەوار خۆی ئەتوانێ ئەو بەڵگانە بەئاسانی لە شوێنی خۆیانا لە شانۆنامەكە دەربێنێ •

پیرەمێرد لەم شانۆنامەیەدا ، سەرەڕای ئەو دەرزانەی خۆی دیاریی کردوون ، بە زمانی قارەمانانی شانۆنامەکەیەوە ، هەلوێستی خۆی لەبارەی کۆمەلێ بابەتی سیاسیو کۆمەلایەتیو ڕۆشنبیری‌یەوە دەربڕیوە کە لەناو ئەوانەیانا خۆی ناوی نەهێناون من ئەمەوێ پەنجە بۆ هەندێکیان درێژ بکەم :

١ ـ بە یەك چاو ڕوانین بۆ ئەم‌بەرو ئەوبەری سنووری دەسکردو ، تەقەلادان بۆ داین‌کردنی سوودو قازانجی دانیشتووانی هەردوو بەرو ، کەلك‌وەرگرتن لە دەولەتی هەردوولا بۆ ئەم مەبەستە •

٢ ـ هیچ حوکمڕانی‌یەکی ناوخۆیی سوودبەخشی ڕاستەقینە نابێ مادەم پشت بە پشتگیریی دەولەتی مەرکەزی نەبەستێ •

٣ ـ گۆڕانی بیری بە ئایندا ناسرانەوەی هاونیشتمان بۆ بە نیشتمانو نەتەوەدا ناسرانەوەی •

٤ ـ گەشەکردنی بیری مرۆ لە خولانەوەوە بەدەوری سوودی خۆدا بۆ خولانەوە بەدەوری سوودی کۆمەلدا •

٥ ـ ڕەخنەگرتن لە بەکارهێنانی ئاین بۆ چەوساندنەوەی خەلكو هەراو ئاژاوە خستنە نێوانیان •

٦ ـ بەختیاری ڕاستەقینە ئەوکەسەیە خەلك خۆشیان بوێ •

٧ ـ گەورە ئەگەر بەڕاستی گەلی خۆی خۆش‌بوێ ، ئەوانیش بە دل ئەویان خۆش‌ئەوێ •

٨ ـ خۆشەویستیی ڕاستەقینە کاتێ ئەبێ کە خەلك بەختەوەر بن •

٩ ـ بایەخی ئەوە کە خەلك تێ‌بگەن مرۆ کاتێ ڕێزی ئەبێ کە ولاتی ئاوەدانو گەلی بەختەوەر بێ •

١٠ ـ داکۆکی لە هەژارانو زەحمەتکێشان بەرانبەر بەوانەی ئەیانچەوسێننەوەو بەری ڕەنجی شانیان ئەخۆن •

١١ ـ دەوری زانست لە شارمزاکردنی خەلکدا لە ژیانی ڕاستەقینەیان •

١٢ ـ ئەوەی مەسلەحەتێکی لە چەوساندنەوەی خەلکدا هەبێ ، ناتوانێ ئەرکی ڕاستکردنەوەی ناتەواوی‌یەکانی ژیانیان لەئەستۆ بگرێ ، چونکە لەگەڵ سوودی خۆی ناگونجێ •

١٣ ـ سیستێمی ژیانی خێلایەتی ناتوانێ پاڵ بەخەلکەوە بنێ بۆ خوێندەواری چونکە لەگەڵ قازانجی خۆی یەکناکەوێ •

١٤ ـ ژیانی خێلایەتی دڕندەیی خۆی بەناچاری بەسەر خەلکدا ئەسەپێنێ •

١٥ ـ بایەخی پێگەیاندنی وەچەیەکی خوێندەوار لەناو ئافرەتاناو ، دەوری ئەمە لە پێگەیاندنی تێکڕای وەچەی نوێدا •

١٦ ـ دەوری نائارامیی سیاسی لە وێرانیی وڵاتو ساردکردنەوەی حوکمڕانانا لە ئاوەدانکردنەوەی ئەگەر نیازی وایشیان بێ •

١٧ ـ دەوری مفتەخۆرانی ناوخۆی کاسەلێسی بێگانە لە بەهەلەبردنی دەولەتی مەرکەزیو ئاشووبنانەوە لە ولاتا •

١٨ ـ جەختکردن لەسەر پێویستیی هەولدان بۆ ڕاستکردنەوەی ناباری‌یەکانی ناو کۆمەڵ بەئاستەمو چاوەڕوانیی لەسەرخۆی هاتەڕووی وەچەیەکی تێگەیشتووی پێگەیشتوو بۆ وەدیهێنانی ئەم ئەرکە •

١٩ ـ زانکردنی وێڵو فام بەسەر سۆزداو داوای خۆدوورگرتن لە هەلوێستی سەرەڕۆیانە لە کاتی ڕوودانی کارەساتی گەورەدا •

٢٠ ـ بە ڕووسووری پیشاندانی کەلەپووری مێژوویی نەتەوەو شانازی‌کردن بە هەلوێستی مەردانەی گەورەپیاوانی گەلو ، بە ناکەس‌بەچەو ناچیز دەربڕینی ئەوانەی بۆ تەماعی دنیا خۆیان بە کلکی داگیرکەری بێگانەوە ئەبەستن •

٢١ ـ له دوو تای ترازووی بەراوردپێکردنا دانانی هەڵوێستی ئەوانەی ئامانجی بەرزی نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌و ئینسانی‌یان ڕەچاوکردووەو ، ئەوانەی لە سنووری سوودی تایبەتیی خۆیان بەولاوە نەیانتوانیوە هەنگاوێ هەڵبێننەوەو ، پشتیان لە هەموو بەهایەکی مەردایەتی‌و گەلدۆستی‌و نیشتمانپەروەری هەڵکردووە .

بەڵام بە تێگەیشتنی من بایەخدارترین بابەت لەم شانۆنامەدا هەڵوێستە لەئاست ڕژێمی حوکمڕانو دەسنیشانکردنی جۆری مامەڵەیە لەگەڵی . مەحموودئاغای کەسی سەرەکیی ئەم شانۆنامەیە ، کە پیرەمێرد لە برگەیەکی شانۆنامەکەدا بە زمانی پەریچیهرەی خێزانی لەوەپاشیەوە وای لێ ئەدوێ کە پێی‌ئەڵێ : « من موتەحەیرم تۆ لەم بەردەڕەقەو لەم نەسلە کەلەشەقە ئەم دەماغەت لەکوێ بوو ؟ » و بە زمانی خۆیشیەوە ، دەربارەی خۆی ، ئەڵێ : « من کوڕی سەلیم شیوەکەلیم ، باوکم لەناو دارو بەردا گەورە بووە، پیشەمان شەڕوشۆڕو تەعەدداو کوشتن‌و بڕینە » .. مەحموودئاغایەکی‌وا کە پاشان لە ڕەوتی بیرکردنەوەو هەڵسووڕانو تێکۆشانا شانبەشانی پەریچیهرەی خێزانی‌و سەلیم‌ئاغای باوکی‌و هەموو خێرخوازانی دەوروبەری لە شارباژێڕو لە سلێمانی‌و لە بانە ، ئاسۆی بیری ئەوەندە ڕوونو بەربڵاو بیێ ، بەرانبەر بە تاوانی دەرمانخواردکردنی لەلایەن نوێنەری ڕژێمەوە لە وڵاتی بابان کە موتەسەڕیفی سەردەمی سلێمانی بووەو ، لە سزای دڵسۆزی بۆ نیشتمانو ویستی چاکەدا بۆ جەماوەری خەڵك ، لەجیاتیی ئەوەی وەك چاوەڕوانی لێ‌ئەکرا عێلجاڕیی لێ بکاو هەموو خزم‌و کەسوکارو قەوموقیلەو چەك‌بەدەستانی عەشایری دەوروبەر دەنگ‌بدا بۆ چوونە سەر سلێمانی‌و بەگژاچوونی موتەسەڕیف‌و تۆلە لێ‌سەندنەوەی ژیانی بەناحەق دوایی پێ‌هێنراوی ، لە ترسی ئەوەی نەوەکا بەر لە گەیاندنەوەی بە خێوەتەکەی خۆی زمانی بشکێ‌و دەمی گۆ

نـەکا چی لـە دلیایەتی بـە براکانی بلێ ، هاوڕێکانی ڕاتەسپێرێ بە زمـانی ئەوەوە پێیان ڕابکەیەنن : « زینهار ، لەسەر خوێنی من بەگژ حوکوومەتدا نەچـن •• » •

مەحموودئاغا ئەوەندە ڕاستـی ڕەوتی دوارۆژی تێکۆشانی بۆ ئـەو ئامانجانەی خۆیو پەریچیهرە لە دلیانا پەروەردەیان کردبوون ، لا مەبەستە، نایەوێ براو پاشماوەو جێگرەکانی هیچ هەنگاوێکی سەرەڕۆیانەو ناوەخت بنێنو کارێبکەن ئەو مەسەلەیەی ئەم گیانی لەپێنـاویا دانـــا ، لە قوڕی خەستی ئەو پیلانە بچەقێ کە خۆپەرستانی بەرچاوتەسکی ناوخۆو نوێنەرانی ڕژێمی داگیرکەری عوسمانی بۆ کوردو کوردستانیان نابـوەوە ، تەنانـەت بەشبەحالی نوێنەری ڕژێمیش ، تاوانەکە پاساوئـەداو ئەیخاتـە ئەستـۆی تۆکەرە ناوخۆییەکانیو ئەلێ : «ئەم موتەسـەڕڕیفـە حەرەکاتێکـی زۆر خراپی کرد ، بەلاّم ناحەقی نەبوو ، لەو پیاوماقوولاّنـی وەتەنپەروەرە کـە حوکوومەتی ئەحمەدپاشایان ڕووخاندو پـەرێی ئیمتیقبـالی کوردستانیـان خنکاند ، دەربارەی من چشتێکیوایان هەلبەستبوو کە موتەسەڕڕیف لـە خۆی ترساو پێشدەستیی کرد » •

* * *

ئەگەر باوەڕمان بەو ڕایە بێ کە ئـەلێ بنووسی ڕۆمـانو چیـرۆکو شانۆنامە لەڕاستیدا لە کارە ئەدەبییەکەیا هەلوێستی خـۆی دەرئەخـــاو ئەیداتە پال قارەمانانی کارەکەیو ، من خۆیشم لەوانەم باوەڕیان بەم ڕایـە هەیە ، بەلێ ئەگـەر باوەڕمان بـەم ڕایە بـێ ئەلێین پیرەمێردیش لـەم شانۆنامەیەدا ، لەڕاستیـدا ، بـیرو بۆچوونی خۆی بە زمانـی قارەمانـانی شانۆنامەکەیەوە دەرئەبڕێ • بەلاّم ئەمەیش مەعنای وانییە ئەو بیرو ڕایانەی لە کارە ئەدەبییەکەدا ئەدرێنە پال قارەمانانی ڕۆمـانو چیرۆکو کەســانی شانۆنامە ، لەڕاستـیدا پێوەندیان بەوانەوە نییەو تەنها هیی بنووسی کـارە

ئەدەبی‌یەکەن ، نەخێر ، مەعنای وا نی‌یە ، چونکە ئەگەر کارە ئەدەبی‌یەکە لەسەر بنەمای مێژوو نووسرابێ‌و ئەو کەسانەی ناویان تیایا هاتووە هەموویان یا زۆرتریان یا هەر هیچ نەبێ کەسە سەرەکی‌یەکانیان کەسی ڕاستەقینە بن یا کەسانی‌وا بن لە چوارچێوەی ڕووداوە مێژوویی‌یەکەدا ئەو بیرو ڕایانەیان بووبێ کە دراونەتە پالیان ، یا لە کارە ئەدەبی‌یەکەیشا ناوی‌تریان لێ نرابێ ، ئەوە بەئاشکرا نیشانەی ئەوەیە ئەو قسەو بیرو ڕایانەی لە چوارچێوەی تێکستە ئەدەبی‌یەکەدا گونجێنراون ، وەك هیی کەسە مێژوویی‌یەکانینی ، هەروایش لە هێلە سەرەکی‌یەکانیانا لەگەڵ بیرو ڕای بنووسی کارە ئەدەبی‌یەکە یەك‌ئەگرنەوە .

* * *

مادەم لەم شوێنەدا قسەمان هاتە سەر ئەوە کە بەناو «پیاوماقوولآنی وەتەنپەروەر » بوون دلی موتەسەڕڕیفیان لە مەحموودئاغا کرمێ‌کردو هانی‌یان لێ‌داو ، وتیشمان بنوس‌و هارەمانو کەس تێدرا لەو بیرو ڕاو بۆچوونانەدا یەکدگیر ئەبنەوە کە لە کارە ئەدەبی‌یەکەدا خراونەتەڕوو ، ئەبێ لەمەوە بگەینە ئەو ئەنجامە کە پیرەمێردیش ، وەك زۆر کەسانی‌تر ، هەر لە سەرەتاوە دەردەکوردە کۆنەکەی دەسنیشان کردووەو زانیویەتی هۆی هۆیانی کوێرەوەریی ئەم خەلکەو پاشکەوتوویی‌و شوێنکەوتوویی ئەم نیشتمانە هەر خودپەرستی‌و شوێنی مەسلەحەتی تەسكو چاوچنۆکانەی خۆ کەوتنی چینێکی دزو جەردەو خەلك‌ڕووتێنەوەو خۆفرۆش‌و خوێنمژە کە پیرەمێرد بە زمانی مەحموودئاغاوە وایان وەسپ ئەکا کە ئەلێ : « ئەم یادگارانە وەیانزانی کە ئەحمەد پاشا نەما خۆیان جلەوی حوکوومەتیان بەدەستەوە دەبێ ، کەچی ئەشباهیان تەحسیلداری‌یان دەست‌ناکەوێ . ئێستاش بە خەیالی ئەمەن ئیجارەی شاربازێر بکەن‌و دێهات بگرنە دەست خۆیان . ئەوە خەیالی مەحالە » . کەواتە وەك چۆن تاقمێکی لەهەل‌گەڕی

جلخواری خۆپەرست هەزار درۆو دەلەسەیان بەنیازی بەد لەگەڵ هـەندێ ڕاستی بۆ مەبەستی چەوت هێناوە ئارا پێکەوە شێـلاو کارێکیـان کـرد. دەوڵەتی عوسمانی میرنشینی بابان ، وەك میرنشینەکانی تری کوردستان ، لە ناوبەرێ ، هەر تاقمێکی لـەو بابەتەیش بوون ئەو بنەمایەیـان لەبنـەوە هەڵتەکاند کە مەحموودئاغای شێوەکەڵ بە هاودەنگی لەگەڵ ژنە ڕۆشنیرو ئازادیرەکەی‌و بە ڕەنگڕێژ ڕشتنی سەلیم‌ئاغای باوکی پێکەوەی‌نابوو بـۆ سوودی کوردی ناوچەکـەو ، سنووری نێوان بەشی عوسمـانی‌و بەشی عەجەمی هەرێمی شارباژێرو بانەی شکاندبـوو و کاری بـۆ ئەوە ئەکـرد کاروباری ناوچەکە بەدەست کەسانی خۆماڵی‌یـەوە بێ‌و ، زەبـروزەنـگ‌و جەورو ستـــەمی جەنـدرمەی عوسمـانـی‌و سەربـازی ئێـرانی لە کۆڵـی ڕەشوڕووتی لادێی ئەو ناوچانە هەڵگیرێ . ئەمانە ئەم نامەردی‌یەیان بـۆ هیچ نەکرد بۆ ئەوە نەبێ خۆیان ، وەك بەرماوەخۆری داگیرکەر ، بتـوانن دوو سێ گوندی کاول‌و وێرانی شارباژێر بە ناوی ئیجارەوە لـە دەوڵـەت وەرگرن‌و بە ڕووتاندنەوەی ئەو گوندی‌یە هەژارانەو لێ‌زەوتکردنی چوار بار ترێ‌و بارێ مێوژو ئیزرەم باسووق‌و بە بەسەرادانی دوو سوخرەو دوو بێگار چەند لیرەیەکیان لێ کۆکەنەوەو گیرفانی خۆیانی پێ گەرم‌کەنەوە .

هەر لەم شانۆنامەیەدا پیرەمێرد بەپێی بارو دۆخی سەردەم‌و ، پشت بەو ڕادە تێگەیشتنەی لە سیاسەتی جیهاناو ئەو ئاگاداری‌یـەی لەبـارەی توانی ناوخۆی کوردەوە بوویەتی ، لایەنگری لەوە کردووە کە ئەم میللەتە لە چوارچێوەی دەوڵەتی حوکمڕانی سەردەما کە ئەودەمە دەوڵەتی عوسمانی بووە ، خاوەنی قەوارەیەکی ناوخۆیی بێ‌و بـۆ ســوودی وڵات‌و خەڵکـی وڵات هەمیشە ڕێگایەك بگرێتەبەر بەری لێ نەگیرابێ‌و دەرگـای لەڕوودا کلیل‌و کلۆم نەکرابێ . ڕاستەکەیشی ئەوەیە ئەتوانین بڵێین پیرە مێرد لـەم جۆرە بیر کردنەوەیەیا پشتی بـە میراتێکی مێژوویی دووروودرێژی کورد

بەستووە • کورد کە تێکڕا هەمیشە کۆمەڵێ میرنشینی دەرەبەگیی جیاجیای لە هەرلایەکی کوردستانا بووە ، ئەو میرنشینانەی هەمیشە تێکڕا لەگەڵ دەوڵەتی گەورەی وەخت بەوجۆرەیان بەسەربردووە کە دان بە فەرمانڕەوایی ئەو دەوڵەتە گەورەیەدا بنێن‌و لە کاروباری ناوخۆیانا کەم‌وزۆر سەربەخۆ بن • تەنانەت دەوڵەتی عوسمانیش پاش داگیرکردنی کوردستانی ئێستای عێراق‌و تورکیا هەر بەم‌جۆرەی مامەڵە لەگەڵ ئەکردن‌و تەنها لە سەدەی نۆزدەهەمدا سیاسەتی خۆی گۆڕی‌و کەوتە تێکدانی یەك لەدوای یەکی ئەو میرنشینانە ، کە ئەمە بە بۆچوونی من پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی وردە تا هۆکەی بزانرێ‌و بگەینە ئەوە ئاخۆ دەوری دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانی ئورووپا لە خستنەسەر ئەم سیاسەتەی دەوڵەتی عوسمانیدا چی‌و چۆن بووە•

بگەڕێینەوە بۆسەر ئەسڵی مەتلەب •

ئەوەتە لە شانۆنامەکەدا مەحمووداغا ئەیەوێ هەر لە ڕێگای هاوکاری‌یەوە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی مەسلەحەتی هاونیشتمانەکانی داین بکاو بیر لەوە ناکاتەوە ڕێگایەکی‌تر بگرێتەبەر • ڕەنگە زۆر کەسی خوێنگەرم کە بەمە بزانن ، بە چاوێکی پڕ لە گومانەوە بڕوانتە مەحموودئاغاو تەنانەت پیرەمێردیش کە بیرێکی‌وای خستووەتە دووتوێی شانۆنامەکەیەوە • بەڵام مەحموودئاغای نووکی قەڵەمی پیرەمێردو پیرەمێردی سەر زمانی مەحموودئاغا وا بیرناکەنەوە • ئەوان سەنگوسووکیی وەزعەکە باشتر ئەکەن‌و ئەزانن ئێمە خۆمان چەندمان لە توانا هەیە • کە موتەسەڕڕیفی عوسمانی لە سلێمانی بە فیتنەجۆیی‌و بەدگۆیی هەڵدێ لەوانەی لەبەر تەماعی خۆیان بۆ مەحموودئاغایان لا تێچاندبوو و دڕدۆنگیان کردبوو لێی ، ئەنێرێ بەدوای مەحموودئاغاداو پیلانی بۆ ناوەتەوە دەرمانخواردی کا ، لە مەجلیسا لێی‌ئەپرسێ : « مەسئەلەی دەرکردنی ئەمانوڵڵا کوری کەریم‌خانی حاکمی بانە چی‌یە ؟ » • مەحموودئاغا

وەلام ئەداتەوە : « پاشام ، ئێمە لە گەڵ بانەدا دراوسێین • هەموو ئالووێرو خرێدوفرۆشتو تیجارەتی ئێرانمان بە واسیتەی بەندەری بانەوەیە • بانەیش لە زەمانی حوکوومەتی بەنی ئەردەلانیەوە تا پێش کەریمخان حاکمی کوردەواریی بووە هیچ فەرقێکی نەکردووە • کەریمخان داوای کارپەردازو پەساپۆرتو ویزەی لە تەبەعەی ئێمە دەکردو دەستی دوو کەسی تەبەعەی عوسمانیی بڕیبوو • یۆنسخان کە نائیبی حوکوومەت بوو لەنگەری بۆ ڕاگرتبوو ، بەڵام ئەمجارە کە دەستی ئەو پیاوانەی بڕی ، تەبەعەو شابەندەر گەلەکۆمەکیان لێکرد ، ڕای کرد • زاتەن یۆنسخان بە وەکالەت لەوێ ئیفای وەزیفە دەکا • هێشتا حوکوومەتی ئێران حاکمیتری نەناردووە » •

« موتەسەڕڕیف : ئەی تۆ بۆچی چووبوویتە بانە ؟ »

« مەحموودئاغا : من خۆم هیچ کوێ نەچووم • مامەکانم بۆ خوازێنی چووبوونە بانە • من ئەگەر هەرچی بکەم ، ئایا خزمایەتیو ئایا موعاوەنەت لەگەڵ ئەمانەدا ، هەمووی بۆ تەقوییەی وەزیفەو ڕەواجی کاری حوکوومەتە • شوکر بە سایەی خواوە نە نوفووزی ئەجنەبی دەناسم ، لە ( کاپیتۆلاسیۆن ) • ئەمەیش سەربەرزیو حورمەتی ئێوەی تێدایە » •

« موتەسەڕڕیف : باشە • من زۆر لە تۆ مەمنوونم • با بچینە سەر سفرە ... » •

جا کە پاش ئەم مەمنوونییە بەدرۆیەو ، پاش ئەم بانگهێشتنی سەر سفرەیە ، کە تۆکەرەکانی موتەسەڕڕیف پیلانە چەپەڵەکەی بەجێدێنن و قاوەی ژاراوی دەرخواردی مەحموودئاغا ئەدەن ، لەگەڵ هەموو ئەمەیشا مەحموودئاغا لە سەرەمەرگا ئەم قسانە ئەکا : « زینهار ، لەکەونە سەودای موخالەفەتی حوکوومەت ! ئاخ چیبکەم بەختی کوردەواری نەبوو • ئەوەی من ئەمویستو تەعقیبم ئەکرد خدمەتی وەتەن بوو • خدمەتی وەتەنیش بە

پشت‌ئەستووریی حوکوومەت ئەبێ • هەرچی حوکوومەت ڕووی لێ وەرگێڕا ، شێر بێ ، ڕێوی‌یە » •

خوێن ساردی‌و واقیع‌بینی‌و دوورئەندێشی‌یەکی وەك ئەمەی لەم بڕگەیەی پێشەوەدا خراوەتەڕوو ، لەلایەن کەسێکەوە کە چارەك سەعاتێ پێش ئەم قسانەی ، ئەوەی ئەو داوای ملپێچی‌لێ‌نەکردن‌و بەگژانەچوونی ئەکا ، دەرمانخواردی کردبێ‌و لەسەر سفرەو خوانی میوانداریی مالی خۆی بەو شێوە نامەردانەیە کوشتبێتی‌و ، هەروا بەشانازی‌یەوە خستە پێش‌چاوی جەماوەری خوێنەوارانی ئەتەوەی ، لەلایەن پیرەمێردێکی ڕۆشنبیری خاوەنی ئەو دلە گەورەی پڕ لە خۆشەویستیی لە ناخی دلو دەروونا ڕیشە داکوتاوەی کوردو کوردستانەوە ، نیشانەی هەستێکی هەرە بالای سیاسەتمەداری‌و ڕەچاوکردنی سوودی ڕاستەقینەی دوارۆژی گەل‌و بە هەلدێرا نەبردنیەتی • من خۆم کە ئێستا ئەم هەلوێستەی ئەوان ئەگێڕمەوە ، نەك هەر وەختە بلێم پێم تەحەممول ناکرێ بەلکو درۆیش ناکەم ئەگەر بلێم ناتوانم بەئاسانی داکۆکیی لێ بکەم • وائەزانم زۆر لەوانەیش ئەم چەند دێڕە ئەخوێننەوە هەر وەك من وان • بەلام سیاسەتی ڕاستەقینە هەلسەنگاندنی هەموو ڕوویەکی مەسەلەو دۆزینەوەی وەلامی دروستی لەسەر بنەمای توان‌و لێهاتن بنیاتنراوی هەموو ئەو پرسیارانەیە ژیان لە هەر بارو دۆخێکی تایبەتیدا ئەیانخاتە بەردەم •

* * *

بەپێچەوانەی ئەوەوە کە بەدرێژایی مێژووی میرالی بابان‌و سۆران ڕوویداوە کە ناکۆکیی ناوخۆیان بە پشت‌بەستن بە ڕۆم دژی عەجەم‌و بە عەجەم دژی ڕۆم چارەسەر کردووەو لەگەل ئەم لا تێکچوون پەنایان بردووەتە بەر ئەولاو بەپێچەوانەیشەوە ، پیرەمێرد لەم شانۆنامەیەیدا با زمانی یەکێ لە کەسە سەرەکی‌یەکانیەوە کە سەلیم‌ئاغای باوکی مەحموود‌ئاغایا

دژی ئەم خۆ بەسەرلایەکا دژی لایەکی‌دی ساغکردنەوەیەو ، یا لە مەودایەکی تەسکی وەك سەرسنووری شاربازێڕو ولاتی بانەیشا بێ ، هەولی ئەوەیەتی لە کورد بگەیەنێ ئەبێ کارێ بکرێ دلی هەردوولا ڕابکیرێ ، ئەوەتە بە زمانی سەلیم‌ئاغاوە بەم‌جۆرە لە دامەزراندنی یۆنس‌بەگی ئەحمەدبەگ بە حاکمی بانە لەلایەن ئێرانەوەو بە هەوڵو تەقەلای خۆیان لای والیی سنەو لایەنگرتنی والیو بە فەرمانی شای عەجەم ئەدوێو ، ئەڵێ : « زاتەن کە خوا ئەمدیوی دایە دەست ئێمەو لەمدیو مەحموودی کوڕم بە ئیرادەی پادشای عوسمانی قائیمەامی هەموو شاربازێڕ بێو لەودیو یۆلس‌خانی کوڕیشمان حاکمی بانە بێو ، ئەمدیوەودیو یەککەونو ، ڕۆمو عەجەمیشمان بەدەستەوە بێ ، خوا یار بێ هیچ قووەتێ ناماتلەرزێنێ » .

بەم‌جۆرە ، بۆ یەکەمین جار ، پیرەمێرد بیرێکی‌وا دێنێتە ئاراوە ، لەسەر بنەمای کەلك‌وەرگرتنی لەیەك‌کاتای کورد لەمدیوو لەودیو بێ ، لەجیاتیی ئەوەی بین بە ڕەگەزێکی ئالۆزیی ژیانو ناکۆکیی نێوان . ئەمەیش لەگەڵ ئەو فەلسەفەی پیرەمێرد خۆیە ئەچێتەوە سەر یەك سەرچاوە کە ویستوویە هەرچی گیروگرفتی ژیانی کوردمواری‌یە لە ڕێگای ئاشتیخوازانەوە لەگەڵ ئەوانەی پێوەندیان بە مەسەلەکەوە هەیە ـ چاربکرێ . ئەم بۆچوونەی پیرەمێرد کە بە زمانی سەلیم‌ئاغاوە دەری‌ئەبڕێ ، یا بەپێچەوانەوە ، هەر هیچ نەبێ ، بەش‌بەحالی ئەو سەردەمە ، زیرەکانەو دووربینانەو واقیع‌بینانە بووەو ، بۆ سوودی دانیشتووانی هەردوو بەری سنووری ناوچەکەو ، قازانجی ڕاستەقینەی هەردوولای ، چ لەئاستی ناوچەو چ لەئاستی ولاتدا ـ دابین‌کردووەو ، یەکێکیش بووە لە ڕێگاکانی بڕینی دەستی ئیمپریالیستانی ڕۆژاوایی کە هەمیشە بەدوای بیانوویەکا گەڕاون پەنجەی پێ وەردەنە ناو کاروباری

هەر ولاتێکی ڕۆژهەلات ، تا پاشان خۆیان ، وەك ناوبژی‌کەر ، بێنە پێشەوەو ، لەو ڕێگایەوە جێ‌پێ‌یەك لەو ناوچەو ولاتەدا بۆ خۆیان بدۆزنەوەو دزدەسەکێکی خۆیانی بۆ سوودی دوارۆژیان تیا دابنێن •

* * *

پیرەمێرد کە لە شانۆنامەکەیا ئەیەوێ نموونەی پیاوی گەورەو کارامە بۆ کورد دروست بکا ، ئەو شێوە کۆنانەی گەورەیی ڕەت‌ئەکاتەوە کە لەسەر بنەمای پێوەندی ژن‌وژن‌خواز لەگەل بنەمالەو خێزانی دەلەمەندو دەسەلاتدار بنیاتنراونو ، شێوەیەکی نوێ دێنێتە ئاراوە کە بنچینەکەی یەکتری ناسین‌و لەیەك‌گەیشتن‌و بەهرەو توانو لێهاتنی ئەو ئافرەتە بێ کە بۆ خوازێنی دەسنیشان ئەکەن •

ئەوەتە کە سەلیم‌ئاغای باوکی مەحموودئاغای کەسی یەکەمی شانۆنامەکە ، مەحموودی کوڕی لەگەل ئەحمەدبەگی کەندەسوورە ئەنێرێ بۆ سیاگوێز ، مەحموود هۆمەری خەزنەدار مەعنای ئەم ناردنەی مەحموودئاغا بەوە لێئەداتەوە کە بچێ چاوی بە پەریچیهرەی کچی ئەحمەدبەگ بکەوێ ، بەلکو دلی بیگرێ‌و داخوازیی بکاو ، بە سەلیم‌ئاغا ئەلێ : «ئاغا ، خوا موبارەکی کا • وا تێگەیشتم مەحموودی کوڕت دەنێری بۆ سیاگوێز بکەوێتە حەلقەی کەمەندی زولفی پەریچیهرەی کچی ئەحمەدبەگەوە • هەرچەند بۆ سیاسەتی ئەمڕۆ تێکەلی‌و خزمایەتی لەگەل ئەماندا بەجێ‌یە ، بەلام مەحموودی کوڕی تۆ تەمامی باغی دەولەتی عوسمانی‌یەو قائیمقامەو بەهۆی قائیمقامەتی‌یەوەیە کە ئەم لەشکرو سوپای ئالانو شاربازێڕو بەرکێو ، ئەم بگرەو بەردەیەی بەدەستەوەیە • ئەگەر نەزەری حوکوومەتتان لەسەر نەبێ لەم بەردە ڕەقەدا دەبێ ئێوە هەر ماشی هۆمەرلیسك بخۆنو ، مەگەر تەنها لە چوار دێی سیوەیلەکەدا بناتناسن • لەپێش‌چاومانە دوێنێ ، هێشتا نەبوە بە پێرێ ، نەڕەشێرێکی وەك

عەزیزبەگی بابان کە بە حەسەب‌و نەسەب‌و شەجاعەت قیاسی لەگەڵ ئێوە ناکرێ ، خزابووە قەڵای سرۆچك بەڕوویان دەکرۆشت‌و خوێڕی‌یەکی وەك سمایل پاشایان ناردبوە سلێمانی ، حاکمیی سلێمانیی دەکرد چونکو کەمەربەستەی دەوڵەت بوو • ئێستا بە من بێ ، ئەگەر بۆ قووەتی عەشائیری بێ وا وەڵەدبەگیی جاف زاواتن ، مەحموود یا ژنێکی لە میرئاودەلی‌یان بۆ بێنە ، یا لە سلێمانی کەسێکی ئەرکانی حوکوومەت بگرنە دەست • بزانە جاف بە ئەکسەری‌یەت ژن لە سلێمانی دێنن کە حوکوومەتیان بەدەستەوەیە • ئینسان دەبێ تەنها بۆ ئەمڕۆ نەژی ، سبەی ڕۆژی ئەولادو عەشیرەت‌و کەسوکاریشی لە پێش‌چاو بێ » • سەلیم ئاغا لە وەڵامیا ئەڵێ : « ئاغا ، بەخوا فکرەکەت پەسەندە ، بەڵام نسیب‌و قسمەت بەدەست خوایە » •

سەلیم‌ئاغا ، دیارە ، تەنها بۆ لەڕوودامان هەر ئەوەندە بە مەحموود هۆمەر ئەڵێ‌و قسەکە لەویا ئەبڕێتەوە •

سەلیم‌ئاغا کە ئەزانێ کچی ئەحمەدبەگ لە هەموو ڕوویەکەوە شایانی خواستنە : خوێندەوارە ، ئازادبیرە ، بە ڕاو تەگبیرە • بۆ دوارۆژی ئەو پرۆژانەی ، لە دڵی خۆیا ، لەمدیو لەودیو ، بۆ مەحموودئاغای کوڕی بنیات‌ناون ، بەسوودو کەڵکە ـ بەو قەدەرە قسەکەی خۆی لەگەڵ مەحموود هۆمەر بڕیوەتەوەو ، مەحموود ئاغایش چووە بە ڕێی خۆیەوە •

* * *

دیارە ، پیرەمێرد کە باوەڕی بە گەشەکردنی بەئاستەم‌و لەسەرخۆو لەسەر بنەمای بنیاتنانی پتەوە ، لەبارەی ژیانی خێزانی‌شەوە ، وەك بەشێکی پڕبایەخی ژیانی مرۆ ، بۆچوونی تایەتیی خۆی هەیە کە بە دوورو درێژی لە دەمەتەقێی نێوان مەحموودئاغاو پەریچیهرەی پاش دیدارو بەیەك‌گەیشتنیانا ڕوونی ئەکاتەوە •

پیرەمێرد ، لە شانۆنامەکەیا بەیەکگەیشتنێکی ، وەك بەدەسەنقەست دروستکراوی ، لەنێوان بووکو زاوای دوارۆژا ڕێکخستووە . لە گفتوگۆی نێوانی ماوەی ئەو بەیەکگەیشتنەیاندا ئەم ڕستانەمان بەرگوێ ئەکەوێ :

پەریچیهرە تێگەیشتنی خۆی لە مەسەلەی ئافرەت لەم ڕستانەدا دائەڕێژێ : « وادەزانن هەرچی بەشی ئافرەت هەیە خوا هەر بۆ ئەمەی خەلق کردوون ئەسبابی کەیفو هەواو هەوەسی کوڕان بن‌و ، تێرنەیش کە ئافرەتی دی بە حەلوای نەرمەقووتی بزانێت . ئیتر ئەمنی‌یەتی نامووس نی‌یە . ئاخ ! ئەموێست خوا یا بە ئافرەتی خەلق نەکردامایە یا نەمخوێندایە وە لە بەر خەرەکدا دانیشتمایە بێ‌حیس‌و بێ‌شوعوور ، دەماغم بە حیکایەتی دێوو پەری‌و چەرخوفەلەکی پیرێژنەکان پەروەردە بیوایە ، ئەوسا نەمئەوت ژنانیش حەقی حەیات‌و مەوجوودی‌یەتیان هەیەو بە شیربایی نافرۆشرێن‌و بۆ تەشکیلی عائیلەو دلسۆزی بۆ مێردو ئەولاد لە پیاوان پێشترن‌و لە حەیاتی عائیلەدا ڕوکنی موهیمن .. » .

لە مەحموودئاغایش ئەم ڕستانە لە وەلامی پەریچیهرەدا ئەبیسین :

«خوێندەواری‌و ڕۆمانی تورکی‌و کتێبی ئەحمەد مەدحەت ، ئادابی موعاشەرەتی ئورووپا ، هەمدەم‌و هەمفکریی سالم‌و کوردی کە زۆرم خۆش‌ئەویستن‌و هەمیشە لە خزمەتیانا بووم ، وایان چەسپاندۆتە کەللەمەوە کە ئافرەت ئەبێ نیوەی حەیاتی پیاو بێ ، هامدەم‌و دلسۆز ، هەمسەوداو بەسۆز بێت . غایەی هەردوولا تەشکیلی عائیلە بێت . مەرام لە تەشکیلی عائیلە نەوەی چاك پێگەیاندنە کە خزمەتی خاك‌و عەشیرەت‌و قەوموقبیلە بکەن وە نەهێلن ولاتیان پامالی بێگانە بێت‌و ، میللەتی داماوی دەستی دوشمن نەبن » .

بەمجۆرە گفتوگۆ لەنێوان هەردولادا بەردەوام ئەبێ .

پەریچیهرە ئەڵێ : تۆ « عەجائیبت لە من ما چۆن لەم بەردەڕەقەدا ئەم لێکدانەوەیەم هەیە • منیش سەرم لە تۆ سڕ ماوە ئەم زەبروزەنگە لەعاقاری پیاو ، ئەم نەرم‌ونیانی‌یە لەڕاستی ژنان لەکوێوە پەیدا بووە ؟ جارێ تۆ سیوەیلیت ، کە سیوەیلی کەللەیان لە گوێزیان سەختترەو ، مەحموودی سەلیم شیوەکەلیت کە لە هەموو براکانی جەنگاوەرترە ، چۆن ئەم فەلسەفەیَ حەیاتەت بۆ حەل بووە ؟ من لە تۆ موتەحەیێرم‌و تۆ لە من سەراسیمە • کەواتە با باوەڕ بە یەك بکەین • کتێبی تورکی‌یش ئەخوێنمەوە • هێجگاری لە ڕەوشتی ئێرەم لاداوەو ، ئەمەم گرتووەتە پێش‌چاو کە ڕۆژێ سەرم پان‌ئەکەنەوە • باز پێم‌خۆشە ، قوبوولی عیززەتی نەفس شکاندن ناکەم » •

مەحمووددئاغایش ئەڵێ :

« ئەگەر ئێمە هەردوکمان لەم ئەخلاق‌و تەبیعەتەدا بین ، هیچ نەبێ خۆمان لە ژیانی هامسەری‌و هامفکری لەززەت ئەبەین‌و ، بە مەحەبیەتی ئەخلاقی‌یەوە خۆش ڕادەبوێرین • ئەمە یەك • دووهەم هەر مەحسوولێکی حەیاتمان بێ ، ئەوانیش لەسەر سروشتی ئێمە بڕۆن ، سەعادەت‌و بەختیاری بۆ خۆیان تەئمین دەکەن‌و ، لە ڕێدا هەیە کەلکی میللەت‌و وەتەنی خۆیان بگرن » •

* * *

مەحمووددئاغا لەم وەڵامەیدا بۆ پەریچیهرە کە بۆخۆی لیمچە موحازەرەیەکە ، ئەچێتە سەر یەکێ لە نیشانەکانی چەرخی نوێ ، چەرخی دەرکەوتن‌و پێگەیشتن‌و گەشەکردنی نەتەوە ، کە چۆن لایەنگری خەڵك لە شێوەی جارانیەوە کە لەسەر بنەمای ئاین بووە ، ئەگوێزرێتەوە بۆلا شێوەیەکی نوێ کە لەسەر بنەمای نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌یەو ، ڕەخنە لەوە

ئەگرێ کە ئەو سەردەمە خەڵك لەسەر بنەمای یەکێتی‌و جیاوازیی ئاییـــن پۆلبەندی‌و ڕیز ئەکران‌و ئەدرانە پاڵ یەك پێوەند • بـەلام ئێـتا لەســەر بنەمای نەتەوەو نیشتمان‌و ، یەکێتیی لەسایـەی سەر بە یەت نەتەوە یا یەك نیشتمان بە بناغەی یەك‌بەرەیی کۆمەڵانی خەڵك دائەنرێ •• لەم‌بـارەوە ، بە زمانی مەحموودئاغـاوە ، لـە شانۆنامەکـــەدا وتراوە : « لە زەمانـــی سەعادەتەوە تا ئەم قەڕنــی ئەخیرە ، ڕایتەیـەك کە هەمـوو میللەتێکـی یەکدەخست ، دین بوو • چەندێك دنیان کرد بە ئالەتی شەڕوشۆڕ • هەر حوکمدارێ ئارەزووی بیوایـە بچوایە بەگژ حوکـوومەتێـــی‌تردا ئیعلانی جیهادی ئەکرد • موسوڵمان موسوڵمانی بکوشتایە جیهاد بوو • ئێـرانی‌و تورك کە هەردوکیان خودایێك‌و پێغەمبەرێکیان دەپەرست، بە ناوی جیهادی دین یا ئیختیلافی مەزهەبەوە ، یەکتریان دەکوشت ، خێر بوو • ئێـستا خەڵك لەم فڕوفێڵە گەیشت • ئیتر نە ئەهلی سەلیب بۆ دین یەکدەگرن ، نە ئیعلانی جیهادی خەلیفە • تەنها ماوەتە ســەر ئەوە ئەو خاکـەی کە بـاوك‌و باپیـری تیا هەلکەوتووەو پڕاوەتەوەو نیشتمانەو خۆتی تیا دەژیت ، نیگەهداریی ئەو خاکە کە وەتەنی پێ‌دەڵێن • ئەوە پێش هەموو مەرامێك دەکەوێ » •

پیرەمێرد ، هــەروا لە ڕیـزی قسەکانـی مەحموودئاغـادا کـە بـۆ پەریچیهرەیان ئەکا ، شێوەی ئەو کۆمەلگای کوردەواری‌یە نەخش ئەکا کە چاوی بڕیوەتە وەدیهاتنی • کەسی سەرەکیی شانۆنامەکەی وا ئەخاتە پێش چاو کە مرۆیەکە لە کۆت‌و زنجیری تەنها بۆ خۆ ژیان ڕزگار بووەو بـووە بە کەسێکی کۆمەڵایەتیی بۆ کۆمەڵ ژیاو ، واتە ئەیەوێ کاری تاکەکـەس بۆ سوودی تێکڕای کۆمەڵ بێ‌و ، کە کۆمەڵیش گەیشتە ئەم ئاستـە بالاو بلندی مرۆڤایەتی‌یەو گەشەی‌کرد ، بۆ هەر تاکە کەسێکی وەك بۆ هەموو کۆمەڵ ئەڕوانێ • لەم ڕووەوە پیرەمێرد بە زمانــی مەحموودئاغـاوە کـە لەگەڵ پەریچیهرەی هاوسەری ژیانی سبەینێی ئەدوێ ، ئەڵێ : « ئەگەر تۆ

نیشتمان نەپارێزی ، قەومو عەشرەتو کەسوکارت دەربەدەر ئەبن‌و یێکەس دەمێنیتەوە . پیاو کە بێکەس بوو ، لە هەموو لایێکەوە تێی‌هەلـدەدەن‌و ، فەرزەن ئێشیـان هەلنـەداو دەولەمەندیـش بـوو ، بەپێـی ئارەزووی بـەشـەریەت‌و حیـسـی ئیجتیماعیی ئینـسانی‌یەت پیاوی تەنها غەریبەو ، غەریبیش لەززەت لە دنیا نابینێ !! وا خۆشە پیاو پارووە نانێکی بێ لەناو کەسوکارو قەوموقیلەدا بیخوا . مادام زیندەگانی کرو پفێکە ، ئەوەی بۆت دەمێنێتەوە هەلکردی یەکدلی‌و دلسـۆزی‌و خۆش‌گوزەرانیی ناو قـەوم‌و نیشتمانە . ئەگەر تۆ میللەتـی خۆتت خۆش‌بـوێ ، ئەوانیـش تۆیـان خۆش‌دەوێ . سەعادەت لە سەعادەتـی زیندەگانیـی خۆشەویستیـدایە . عیشق‌و سەودای جەمالێك فەردی‌یە . ئێستا بلێین هەردوکمان یا بۆ جەمال یا بۆ کەمال یەکتریمان خۆش دەوێ ، هەرچی بلێیت ئەمە خوسووسی‌یـە ، لەززەتی خۆشەویستی‌یەکی عومووميی تیا نی‌یـە . هەرگـاه عومـووم خۆشی‌ویستی ، ئەوسایە لەززەت لە خۆشەویستیی خوسووسی دەبینـی ، چونکو ئەگەر قەوموقیلەت خۆشیان‌نەوێت ، با منیش زۆرم خۆش‌بوێت، باز ئەو لەززەتەی نی‌یە . وەقتێ لەززەتی خۆش‌گوزەرانی دەبێ ، میللەتت دەولەمەند بێ ، زەلیل نەبێ . هەرچەند چاوت بە زەلیلی‌و داماویی ئەوان بکەوێ ، تۆ هەرچی بیت ، دلت دەگیرێ‌و عەیشت تال ئەبێ . بەلام کـە عەشرەتت لەپێشـەوە بوو و وەتەنت ئـاوا بـوو ، لـە هەر نۆشـەیێکـەوە شایی‌و سەیرانێك دەبێ‌و لە هەر کەسێکیدا گوزەرانێ دەبێ ، ئەوسا بە دلخۆشی‌یەوە دلداری خۆشە » .

ئەمەی پیرەمێرد بە زمانی مەحمودئاغاوە بە پەرچیمرەو ، لە رێگای ئەوەوە بە هەموومانی ئەلێ ، پوختەیەکی هەموو فەلسەفەی خێرخوازانـی بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی‌یە هەر لە پێغەمبەرانی خواوە بیگرە تا چی حەکیم‌و فەیلەسووف‌و کەسانی مرۆپەروەرو ئینسـانـدۆسـتی رووی ئەم

سەرزەمینەیە ، بەلام بەگوێرەی ڕیزبەندیی نوێی قۆناغەکانی ژیانی ئادەمیزاد دەرزی بیروباوەڕی شۆڕشی دیموکراتیی ئورووپایە کە لە شۆڕشی فەرەنسەوە دەستی پێکردووە ، لەگەڵ ئەوەیشا کە هێشتا نەك هەر لە ئورووپای زادەی شۆڕشی فەرەنسەدا ، بەڵکو لە سەرانسەری جیهانا بەڕادەیەکی پوختو تێروتەسەل نەهاتووەتەدیو ، هێشتا ئەرکی خەباتێکی زۆرو سەخت لەئەستۆی مرۆڤایەتیدایە بۆ وەدیهێنانی • هێنانەدیی ئەرکیوا هەرگیز کارێ نییە بە کۆمەڵگای سەرمایەداری بکرێ ، هەرچەند پێشکەوتوویش بێو ، هەرچەند جەماوەریش توانیبێتیان چەردەیێ لە مافی زەوتکراوی سەدەهای دوورو درێژی خۆیان لەسایەیا وەربگرنەوە • ئەمە ئەرکی کۆمەڵگایەك نییە ڕەحمو بەزەیی جێی تیا نەبێتەوەو لەسەر بنەمای خوێنمژینی بەشی زۆری خەڵك بۆ سوودی کۆمەڵێکی کەم دامەزرابێ • ئەرکی کۆمەڵگایەکی بەڕاستی سۆشیالیستو دیموکراتو ئینساندۆستە • هاتنەدیی ئەرکیوایش زەمانێکی زۆری ئەوێ ، بەلام پیرەمێردی ئینسانو ئینساندۆست بە پێویستی سەرشانی خۆیی ئەزانێ بە زمانی مەحموودئاغاوە هاولێشتمانانی خۆی بەم گیانە پیرۆزە پەروەردە بکا •

* * *

پیرەمێرد بۆ ڕزگاربوونی گەل لە بەشێکی زۆری ئەو دەردو ئازارانەی بەدەسیانەوە ئەنالێنێ ، پشت بە خوێندەواری ئەبەستێ • ئەو لای وایە ئەگەر خوێندەواری بەناو ئەم خەڵکەدا بڵاوبێتەوە ، خەڵك چاویان ئەکرێتەوەو فڕوفێڵی کەسانی درۆزنو ساختەچییان بەسەرا تێناپەڕێ ، چونکە هەر ڕووداوێکیان هاتەڕێو هەر بیروباوەڕێکیان لە هەر بەرگێو سیالێکا پیشاندرا ، ئەتوانن پشت بە هێزی خوێندەواری لەو ڕووداوە بکۆڵنەوەو ئەو بیروباوەڕە تاوتوو بکەنو هەڵوێستی ڕاستی پێویستیان لەئاست وەربگرن •

کەواتە ، ئەو خوێندەوارییەی پیرەمێرد بەدوایا عەودالە بۆ گەلەکەی، نە تەنها حاڵەتی توانی لەیەککردنەوەی خەتی ڕەش‌و سپییەو نە تەنها بڕینی قۆناغێ یا زیاتر لە قۆناغەکانی خوێندن ، هەرچەنــد ئەم دوو پلەیـــەی خوێندەوارییش بایەخێکی گەورەیان هەیەو مەرجی دەس‌لێ‌هەڵنەگیراوی گەیشتن بە خوێندەواریی ڕاستەقینەن . ئەو خوێندەوارییەی پیرەمێرد بە زمانی مەحموودئاغای کەسی یەکەمی شانۆنامەکەیەوە بە ئاواتی ئەخـوازێ بۆ میللەتەکەی ، گەیشتنە بــە حاڵەتی هوشیـاری . گەیشتــە بە قۆناغـی گواستنەوە لــە خۆپەرستی‌یـەوە بـۆ کۆمەڵپەرستی .. ئەوەیـە کــە مەبەست‌بوونی ئاوەدانی‌و پێشکەوتنی وڵات‌و سەربەرزی‌و سەفرازیی گەل ببێ بــە شتێکی جێگرتوو لە دڵ‌و دەروونی هەر هاووڵاتێکاو بچێتە نـاو خوێنیەوەو وەك داب‌ونەریتی جێگیربووی بەمیرات‌بۆماوەی سەدان ساڵی باب‌وباپیران لەناو کۆمەڵا بچەسپێ .. ئەو خوێندەوارییەی کەوا پیرەمێرد مەبەستیـەتی لە هەمـوو ئـاوەدانی‌یـەکی کـوردەوارییا بڵاوبێتــەوە ، خوێندەوارییەکە مرۆ بیەستێتەوە بە گەل‌و وڵاتەوەو وای‌لێ‌بکا خۆشـی‌و ناخۆشیی ژیانی خۆی لە خۆشی‌و ناخۆشیی ژیانی گەل‌و باری وڵاتا ببینێتەوە چونکە لای‌وایە قەدری هاونیشتمان بەوەوە بەندە کە وڵاتی ئاوەدان‌و میللەتێ لە مافی خۆ بەرخوردارو ڕێزلێ‌گیراو بێ . خۆ ئەگەر وانەبوو ، واتە نە وڵات ئاوەدان‌و نە میللەت لە مافی خۆی بەرخوردار بوو، ئەوە وائەگەیەنێ خەڵکەکە بۆ مەبەستی ئاوەدانیی وڵات‌و لە ماف بەرخورداریی خۆیان هەوڵ‌نادەن ، بـا بە دەمیش لە ئیدیەای بێ‌بنەمای نیشتمانپەروەری هیچیان نەهێشتبێتەوە . کە میللەتیش هەوڵی بۆ ئاوەدانیی وڵات‌و لەماف‌بەرخورداریی خۆی نەدا ، ئەوە واتە هەرکەس لەدووی سوودی تایبەتیی خۆی ئەگـەڕێ‌و ، گــەوێ خاوەن‌دەسەڵات بێ خەڵکی‌تر ئەکا بە ژێردەستەی خۆی‌و ، لەم‌حاڵەدا وڵات ئەبێ بە هەراو پشێوەو ، ئەوەی بتوانێ دەس ئەگرێ بەسەر ناوچەیەکـاو

تیا ئەبێ بە دەرەبەگو خەڵکەکەی ئەکا بە ڕەنجبەری خۆی‌و ، سوودی تایبەتی ئەبێ بەو سەنگ‌و ترازووەی هەر ئەس سەنلوسوودیی کاروباری پێ ئەکاو ، کە وایش بوو کەس نابێ بە شتێکی ڕاستەقینە ، چونکە هیچیەتیی ڕاستەقینە لەوەدایە مرۆ بۆ قازانجی هەموان تێکۆشێ .

ئەمانە گشت دەرزی پەروەرشتی نیشتمانی‌و کۆمەڵایەتێ پیرەمێرد بە زمانی مەحموودئاغاوە پێمان‌ئەڵێ‌و ، ئەیەوێ بەم گیانە پەروەردەمان بکا، بۆیە لە شانۆنامەکەیا ئەنووسێ : « ئاخ ! خوا ڕۆژێك بڕەخسێنێ کە هەر شارێك خوێندەواریی تێ‌بکەوێ . هەموو بزانن کە خۆشی‌و قەدری ئینسان بە حورمەتی قەوم‌و ئاوەدانیی نیشتمانیەوەیە ، ئەگینە ئێستا من بڵێم : وەتەنپەروەرم ، درۆ دەکەم . هەموو بۆ دەبدەبەو ناوو شوهرەتی خۆم بەگژ عەشرەتەکانی‌تردا دەچم . لەبەرئەوە گەورەی عەشیرەتەکانی‌تر دیارە نایانەوێ من ببم . هەرکەسە بووەتە دزی گای خۆی‌و ، هەریەکە بووەتە ملۆزمی فەقیرو هەژاری قەتمەیێك . هیچ‌کەس نابینم جوزئی مەنفەعەتێکی خۆی بۆ مەنفەعەتێکی زۆری عومومی فیدا بکاو ، تا هەرکەسە بۆخۆی بێ بە هیچ نابێ ، با ئەمڕۆیش بڵێن پارەدارە خۆشیان‌ئەوێ . سبەینێ کە خوێندەواری چاوو گوێی میللەتی کردەوەو زانی‌یان هەر بۆ خۆیەتی ، ئەو قەدرەی نامێنێ » .

* * *

پیرەمێرد لە ڕزی قسەکانیدا بە ناوی مەحموودئاغاوە لەگەڵ پەرچیهرەی خێزانی دوارۆژی ، ڕایەك ئەخاتە ڕوو پوختەکەی ئەچێتەوە سەر ئەوە کەسێك لەبارەی کۆمەڵایەتی‌یەوە لە بەرەی ئەوانە بێ جەماوەری ڕەشوڕووت ئەچەوسێننەوە ، بۆئەوە دەس‌لادا ئەرکی پێگەیاندن‌و ڕزگارکردنیان لە چەوساندنەوە بگرێتە ئەستۆ ، چونکە ئەو پێگەباندن‌و ڕزگارکردنی خەڵکە لە قازانجی خۆی نی‌یە . کەواتە ناتوانێ ئەو ئەرکە

بەدی بێنێ . ئەوەتە پیرەمێرد بە زمانی مەحموودئاغاوە ئەڵێ : « ئێستا من کە مەوقیعێکی بلندی عەشیرەتی‌و حودوومەتیم هەیە ، پیم ناڕێ عەربی ئیسلاحی ئەم قەومە بدەم‌و ، ئەگەر ڕاستیشت دەوێ بە نیەتیم دەست نادا ، چونکە ئەم خەڵکە ئەگەر تێگەیشتوو بن ، بۆ من دەست نادەنە تفەنگ‌و بۆم بچن بەگژ لەشکری دوشمنی منداو ، ئەم خاکی ئێمەیش خوا ئاوەکەی وا بۆ ڕشتووە هەموو عەشائیر دوشمنی یەکین و لە حودوودیشداین ، لەبەرئەوە بۆمان ناکرێ ئەم ئەهالیە سەوقی سەر خوێندەواری بکەین‌و لەدەست خۆمانی بکەینەوە . ئەمە مەسلەکی ناچاری‌یە ، یەعنی من بمەوێ‌و نەمەوێ دەبێ هەمیشە سێسەد چوارسەد تفەنگم ئامادە بێ ، ئەگەرچی ئەمە حەیاتێکی وەحشەتە » .

ئەمەی پیرەمێرد ئەیڵێ دوو خاڵی وردی تیایە ، یەکەمیان لە کرۆکدا لەگەڵ یەکێ لە بنەماکانی بیری سۆشیالیستی یەکئەگرێتەوە . ئەو یەکگرتنەوەیش لەوەدایە لە بیری سۆشیالیستیدا ئەرکی ڕزگارکردنی کۆمەڵ لە ڕژێمی چەوساندنەوەی چینایەتی بە چینی کرێکار سپێرراوە ، چونکە ئەم چینە تاقە چینێکە ئەگەر نەشێوێنرابێ‌و لەخشتەنەبرابێ‌و باری چینایەتی ڕاستەقینەی خۆی بفامێ ، هیچ سوودێکی لە چەوساندنەوەی هیچ کۆمەڵە خەڵکێکا نی‌یە ، بۆیە کە دێتە مەیدانی ئازادکردنی کۆمەڵەوە بەڕاستی دێتە مەیدانەوە .

دووەمیشیان ئەوە کە مرۆ ڕۆڵەی ئەو ئاووهەوا کۆمەڵایەتی‌یەیە تیا پەیدا بووەو تیا پەروەردە بووەو ، ئەگەر کارایەکی لاوەکی نەیەتە پێشەوە ڕەوتی ژیانی پێ بگۆڕێ‌و بیخاتە سەر ڕێگایەکی نوێ ، خۆی بە ناچار ئەبینێ هەر لە چوارچێوەی ئەو سوودو قازانجانەدا بسووڕێتەوە کە بارو دۆخی ژیانی ڕەنگی بۆ ئەڕێژێ ، بەڵکو لەوە زیاتر نازانێ .

هەروا پیرەمێرد کە ئەم بیرە بە زمانی مەحموودئاغاوە دەرئەبڕێ

سەرەنجام تەیشیکا یە بەلگەیەکی‌تر بۆ ڕەوایـیی ئـەو باوەڕەی بووە بـە سەرچاوەی دیاری‌کردنی زۆر لەو هەلوێستانەی لە ژیانـی خـۆیا ناونـی‌و باوەڕێکی پتەوو جێگرتووی پێ بووەو ئێمەیش یەك دوو جار لەم وتـارەدا پەنجەمان بۆ درێژ کردووە ، کە ئەویش باوەڕی متمانەنەکردنە بە چاکبوونـی ڕاستەقینەی بارو دۆخی کۆمەڵ ، مەگەر بەئاستەم‌و لەسەرخۆو لەئەنجامی گەشەکردنی هێدیی هەموو ڕووەکانی ژیانی کۆمەڵدا • ئەوەتـە دوایـیی قسەکانی لەگەڵ پەریچیهرە بەوە دێنێ کە ئەڵێ : «جا ئەگەر خوا بەزەیی بە مندا بێ‌و ڕەفیقەیێکی دڵسۆزم بداتێ هیچ نەبێ بە شەو کە فەراغەتێکمان بوو دەردی دڵ لای یەك هەڵئەڕێژین‌و تەسەللایێکمان بەیەکتری ئەبێ‌و ، ئەگەر خوایش بیدا ، ئەولادمان بێ ، بەپێی دڵو دەروونـی خۆمـان پەیێنینـــە بەرهەم » •

بەلای منەوە ئەم ڕستەیـەی پیرەمێـرد ، بـە زمانـی مەحموودئاغای شـیوەکـەڵـەوە ، لـە چـوارچێـوەی دەمـەتەقێی نێـوانی مەحموودئاغاو پەریچیهرەی خێزانی دواڕۆژیا ، لە تێکستی شانۆنامەکەیای گونجاندووە ، بەبێ‌پێچوپەنا وائەگەیەنێ باوەڕی وابووە باری کۆمەڵ هەرگیز بە قەڵەمباز نا ، بەڵکو وردەوردەو لەسەرخۆ ڕاست ئەبێتەوەو ، پێویستی بە گۆڕانـی ئاستی تێگەیشتوویی‌و پێگەیشتوویی ئەندامانی کۆمەڵە • جا کـە ئەمـە وابوو ، ئەبێ پیرەمێرد لایشی وابووبێ مـادەم کۆمـەڵ لەخـۆیا ئامـادە نەبووبێ بۆئەوەی باری لاری ڕاست بێتەوەو ، نەگەیشتبێتە ئاستی ئامادەیی بۆ گۆڕانی دەسەڵاتدارێتی یا جۆری ڕژێمی کۆمەڵایەتی بە یەکێکی‌ترو ، مەسەلەی تەقـەلای گۆڕینەکە با لەگـەڵ بەشداری‌کردنـی کۆمەڵاتێکـی فراوانی خەڵکیشا بێ ، لە کرۆکا هەر لە سنووری دەستەیەکی کەمـی لـە بیروبۆچوونی خەڵکەکە دابڕاودا بێ ، ئەگەر ئەو دەستە کەمە ئەوەیشیان بۆ بڕەخسێ کە دەسەڵاتدارێتی یا تەنانـەت خودی ڕژێمـی کۆمـەڵایەتـی‌یش

بگۆڕن بە ڕژێمێکی بەدیمەن لەپێشتر ، لەڕاستیدا شتێکی ئەوتۆیان نەکردووە ، چونکە لە سوورەتی نوێنی تەنها دەسەلاتداریی یا سیچ لە خەلکەکەدا ناگۆڕێ و ، لە دەسەلاتدارێتی خۆیشیا تەنها دەموچاوو سەروسیما گۆڕاوەو ، کەمجار وائەبێ دەموچاوە نوێکە جیاوازی یەکی ئەوتۆی لە دەموچاوی پێشوو بێ ئەندازەیەك کار بکاتە هەندێ سەری باری ژیانی خەلکەکە • لە سوورەتی گۆڕینی ڕژێمیشا ، مادەم گۆڕینی ڕژێم پێویستی بە بنکەیەکی بەربلاوی ئەوتۆی جەماوەری یە بۆ جێگیرکردنی ڕژێمی نوێ لەجێی ڕژێمی پێشوودا تێکۆشێ و ئەو بنکەیەیش لی یە ، دیسان ، با هەندێ شتیش بەدیمەنو ڕووکەش بگۆڕێن ، ناخی کۆمەل هەر ناخەکەی جارانەو شتێکی ئەوتۆ نەگۆڕاوەو ، زوو بێ یا درەنگ ، کار ، لە ڕووی نەگۆڕانی کرۆکەوە ، ئەگەڕێتەوە سەر دۆخەکەی جارانی یا شتێکی نزیك لەوەو ، هەر ئەبێ چاوەڕوان بین کۆمەل لەسەرخۆو لەبنەوە گۆڕانی بەسەرا بێ و ، لە حالەتێکەوە بچێتە حالەتێکی ترو ، وای لێ بێ بەڕاستی پێویستی بە ڕژێمێکی نوێ بێ •

بیرو بۆچوونی وا زۆر جار قسەی تالو سەرزەنشتی ناواقیعیی لە هەندێ لە لاوانی نیشتمانپەروەری خوێنگەرمی کەمتەجرەبەوە هێناوەتە ڕێی پیرەمێرد ، بەلام سەرەنجام بۆ ئەو لاوانە خۆیشیان دەرکەوتووە تێکڕا بیگری ئەو لەسەر هەق بووە نەك خۆیان ، بەلام کەسیان بە خۆی نەزانیوە کە مەسەلەکە وایە تا کاتێ کە یا لەبەر لەکارکەوتنی خودی خۆی ، یا لەبەرئەوەی بارو دۆخەکە وا نەماوە هەمووکەس بتوانێ پەلی تیا بهاوێ ، توانی ئەوەی نەماوە هەلوێستی خۆی ڕاستکاتەوە •

* * *

پاش ئەم هەموو باری سەرنجانەی پیرەمێرد بە زمانی مەحموودئاغاوە
دەری بڕین ، سەرە دێتە سەر ئەوە بە زمانی پەریچیهرەیشەوە شتێ بلێ • لەم
مەیدانەیشا دێتە سەر شیکردنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی باری ژیانی
ئافرەتو ، بە زمانی ئەمیشەوە وا دەرئەبڕێ کە ئەمیش هەر لەوباوەڕەدا بێ
لە ڕێگای پێگەیاندنو ئامادەکردنی وەچەی دوارۆژەوە نەبێ بۆ
تێگەیشتنی پێویستی گوڕینی کۆمەڵ ، باری لاری کۆمەڵ ڕاست
ناکرێتەوە • ئەمیش بۆ دابینکردنی وەدەستهێنانی دوارۆژ پشتی هەر بە
پێخوێندنی وەچەی نوێ ئەستوورە : «••• ئەگەر لە مێردم پشتئەستوور
بم عوودیش لێئەدەمو گۆرانیش ئەڵێم • لیهایەت پێمئەڵێن «سۆزانی» ،
خۆ هیچ نەبێ ئاسارێکی سەنایعی نەفیسەو جەسارەتێکی مەدەنیبە دەخەمە
ناو جینسی لەتیفەوە • ئەو لەونە ، یەعنی ئەم حوڕڕیەتە بەکەڵکی کەس
ناشێ • کەواتە ئەگەر هەر بە کچێنی لە ماڵی باوکدا بمێنمەوە ئەم حیسیاتە
ئەخەمە بن گوێزی سیاگوێزەوە دەینێژم ، بەڵام تا پێمبکرێ کچان
کۆدەکەمەوە ، بە ڕۆژ جزمیان بۆ دەنووسمەوە ، فێری خوێندنیان دەکەم ،
ئەوسا بە خوێندەواران سوپای خۆم وا ڕێکدەخەم کە ڕۆژێک بێ
لەشکری نادانی بشکێنن » •

لێرەدا سەرنجی خوێندەواری ئازیز بۆ پیشاندانی چۆنیەتیی
تێگەیشتنی ئەو سەردەمە(و بەڵکو تارادەیەکیش ئێستا )ی جەماوەر لە
هونەرو ، بۆ هەڵوێستی لە هەڵسەنگاندنی هونەرمەندانماو ، بۆئەوەیش
ڕائەکێشم کە پیرەمێرد چۆن ئەیەوێ بە زمانی کچە ئاغایەکی لادێیەکی
ڕەقەڵی وەک سیاگوێزەوە خەڵک لە باری ڕاستی مەسەلەکە بگەیەنێ •
هەروا سەرنجی بۆ وردبوونەوەیش لە باوەڕی پتەوی ئەو کچە ڕۆشنبیرە
نەبەزو کۆڵنەدەرە بە دوارۆژ ، بە بێ گومانیی ڕەوپێکردنی لەشکری
تاریکیو هەڵهاتنی خۆری گەشی جیهانگرەوەی خوێندەواری ڕائەکێشم کە

نیشتمان نەپارێزی ، قەومو عەشرەتو کەسوکارت دەربەدەر ئەبنو یێکەس دەمێنیتەوە ، پیاو کە یێکەس بوو ، لە هەموو لایێکەوە تێیهەڵـدەدەنو ، فەرزەن تێشیـان هەڵنـەداو دەولەمەندیـش بـوو ، بەپێـی ئارەزووی بـەشـەریەتو حیسـی ئیجتیماعیی ئینـسانیەت پیاوی تەنها غەریبەو ، غەریبیش لەززەت لە دنیا نابینێ !! وا خۆشە پیاو پاروەوە نانێکی بێ لەناو کەسوکارو قەوموقیلەدا بیخوا ، مادام زیندەگانی گرو پێکە ، تەوەی بۆت دەمێنیتەوە هەلکردی یەکدلیو دلسۆزیو خۆشگوزەرانیی ناو قـەومو نیشتمانە ، ئەگەر تۆ میللەتـی خۆت خۆشبـویێ ، ئەوانیـش تۆیـان خۆشدەویێ ، سەعادەت لە سەعادەتـی زیندەگانیـی خۆشەویستیـدایە ، عیشقو سەودای جەمالێك فەردییە ، ئێستا بلێین هەردوکمان یا بۆ جەمال یا بۆ کەمال یەکتریمان خۆش دەویێ ، هەرچی بلێیت ئەمە خوسووسییـە ، لەززەتی خۆشەویستییەکی عومومیی تیا نییـە ، هەرگـاە عومـووم خۆشیویستی ، ئەوسایە لەززەت لە خۆشەویستیی خوسووسی دەبینـی ، چونکو ئەگەر قەوموقیلەت خۆشیاننەوێیت ، با منیش زۆرم خۆشبوێیت، باز ئەو لەززەتەی نییە ، وەقتێ لەززەتی خۆشگوزەرانی دەبێ ، میللەت دەولەمەند بن ، زەلیل نەبن ، هەرچەند چاوت بە زەلیلیو داماویی ئەوان بکەویێ ، تۆ هەرچی بیت ، دلت دەگیرێو عەیشت تاڵ ئەبێ ، بەلام کـە عەشرەتت لەپێشەوە بوو و وەتەنت ئـاوا بـوو ، لـە هەر نۆشـەیێکـەوە شاییو سەیرانێك دەبێو لە هەر کەسێکیدا گوزەرانێ دەبێ ، ئەوسا بە دلخۆشییەوە دلداری خۆشە » .

ئەمەی پیرەمێرد بە زمانی مەحمودئاغاوە بە پەرچیمەرەو ، لە ڕێگای ئەوەوە بە هەموومانی ئەلێ ، پوختەیەکی هەموو فەلسەفەی خێرخوازانـی بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتییە هەر لە پێغەمبەرانی خواوە بیگرە تا چی حەکیمو فەیلەسووفو کەسانی مرۆپەروەرو ئینسـاندۆسـتی ڕووی ئەم

سەرزەمینەیە ، بەڵام بەگوێرەی ڕیزبەندیی نوێی قۆناغەکانی ژیانی ئادەمیزاد دەرزی بیروباوەڕی شۆڕشی دیموکراتیی ئورووپایە کە لە شۆڕشی فەرەنسەوە دەستی پێ‌کردووە ، لەگەڵ ئەوەیشا کە هێشتا نەك هەر لە ئورووپای زادەی شۆڕشی فەرەنسەدا ، بەڵکو لە سەرانسەری جیهانا بەرادەیەکی پوختەو تێروتەسەل نەهاتووەتەدیو ، هێشتا ئەرکی خەباتێکی زۆرو سەخت لەئەستۆی مرۆڤایەتیدایە بۆ وەدیهێنانی • هێنانەدیی ئەرکیوا هەرگیز کارێ نییە بە کۆمەڵگای سەرمایەداری بکرێ ، هەرچەند پێشکەوتوویش بێو ، هەرچەند جەماوەریش توانیبێتیان چەردەیێ لە مافی زەوتکراوی سەدەهای دوورو درێژی خۆیان لەسایەیا وەربگرنەوە • ئەمە ئەرکی کۆمەڵگایەك نییە ڕەحمو بەزەیی جێی تیا نەبێتەوەو لەسەر بنەمای خوێنمژینی بەشی زۆری خەڵك بۆ سوودی کۆمەڵێکی کەم دامەزرابێ • ئەرکی کۆمەڵگایەکی بەڕاستی سۆشیالیستو دیموکراتو ئینساندۆستە • هاتنەدیی ئەرکیوایش زەمانێکی زۆری ئەوێ ، بەڵام پیرەمێردی ئینسانو ئینساندۆست بە پێویستی سەرشانی خۆیی ئەزانێ بە زمانی مەحموودئاغاوە هاونیشتمانانی خۆی بەم گیانە پیرۆزە پەروەردە بکا •

* * *

پیرەمێرد بۆ ڕزگاربوونی گەل لە بەشێکی زۆری ئەو دەردو ئازارانەی بەدەسیانەوە ئەناڵێنێ ، پشت بە خوێندەواری ئەبەستێ • ئەو لای وایە ئەگەر خوێندەواری بەناو ئەم خەڵکەدا بڵاوبێتەوە ، خەڵك چاویان ئەکرێتەوەو فڕوفێڵی کەسانی درۆزنو ساختەچییان بەسەرا تێناپەڕێ ، چونکە هەر ڕووداوێکیان هاتەڕێو هەر بیروباوەڕێکیان لە هەر بەرگو سیالێکا پیشاندرا ، ئەتوانن پشت بە هێزی خوێندەواری لەو ڕووداوە بکۆڵنەوەو ئەو بیروباوەڕە تاوتوو بکەنو هەڵوێستی ڕاستی پێویستیان لەئاست وەربگرن •

کەواتە ، ئەو خوێندەواری یەی پیرەمێرد بەدوایا عەودالە بۆ گەلەکەی، نە تەنها حالەتی توانی لەیەك‌کردنەوەی خەتی ڕەش‌و سپی‌یەو نە تەنها بڕینی قۆناغێ یا زیاتر لە قۆناغەکانی خوێندن ، هەرچەنـد ئەم دوو پلەیـەی خوێندەواری‌یش بایەخێکی گەورەیان هەیەو مەرجی دەس‌لێهەڵنەگیراوی گەیشتن بە خوێندەواریی ڕاستەقینەن . ئەو خوێندەواری‌یەی پیرەمێرد بە زمانی مەحموودئاغای کەسی یەکەمی شانۆنامەکەیەوە بە ئاواتی ئەخـوازێ بۆ میللەتەکەی ، گەیشتنە بـە حالەتی هوشیـاری . گەیشتـە بە قۆناغـی گواستنەوە لـە خۆپەرستی‌یـەوە بـۆ کۆمەڵپەرستـی .. ئەوەیـە کـە مەبەست‌بوونی ئاوەدانی‌و پێشکەوتنی وڵات‌و سەربەرزی‌و سەفرازیی گەل بێ بـە شتێکی جێگرتوو لە دڵ‌و دەروونی هەر هاووڵاتێکاو بچێتە نـاو خوێنیەوەو وەك دابونەریتی جێگیربووی بەمیرات‌بۆماوەی سەدان ساڵی باب‌وباپیران لەناو کۆمەڵا بچەسپێ .. ئەو خوێندەواری‌یەی کەوا پیرەمێرد مەبەستیـەتی لە هەمـوو ئـاوەدانی‌یـەکی کـوردەواری‌یا بڵاوبێتـەوە ، خوێندەواری‌یەکە مرۆ بیەستێتەوە بە گەل‌و وڵاتەوەو وای‌لێبکا خۆشـی‌و ناخۆشیی ژیانی خۆی لە خۆشی‌و ناخۆشیی ژیانی گەل‌و باری وڵاتا ببینێتەوە چونکە لای‌وایە قەدری هاونیشتمان بەوەوە بەندە کە وڵاتی ئاوەدان‌و میللەتی لە مافی خۆ بەرخوردارو ڕێزلێ گیراو بێ . خۆ ئەگەر وانەبوو ، واتە نە وڵات ئاوەدان‌و نە میللەت لە مافی خۆی بەرخوردار بوو، ئەوە وائەگەیەنێ خەڵکەکە بۆ مەبەستی ئاوەدانیی وڵات‌و لە ماف بەرخورداریی خۆیان هەوڵ‌نادەن ، یـا بە دەمیش لە ئیدیعای بێ‌بنەمای نیشتمانپەروەری هیچیان نەهێشتبێتەوە . کە میللەتیش هەوڵی بۆ ئاوەدانیی وڵات‌و لەماف‌بەرخورداریی خۆی نەدا ، ئەوە واتە هەرکەس لەدووی سوودی تایبەتیی خۆی ئەگـەڕێ‌و ، ئـەوێ خاوەن‌دەسەڵات بێ خەڵکی‌تر ئەکا بە ژێردەستەی خۆی‌و ، لەم‌حالەدا وڵات ئەبێ بە هەراو پشێوەو ، ئەوەی بتوانێ دەس ئەگرێ بەسەر ناوچەیەکـاو

تیا ئەبێ بە دەرەبەگو خەڵکەکەی ئەکا بە ڕەنجبەری خۆیو ، سوودی تایبەتی ئەبێ بەو سەنگو ترازووەی هەرکەس سەنگوسوودیی کاروباری پێ ئەکاو ، کە وایش بوو کەس نابێ بە شتێکی ڕاستەقینە ، چونکە هیچیەتیی ڕاستەقینە لەوەدایە مرۆ بۆ قازانجی هەموان تێبکۆشێ •

ئەمانە گشت دەرزی پەروەرشتی نیشتمانیو کۆمەڵایەتیێ پیرەمێرد بە زمانی مەحموودئاغاوە پێمانئەڵێو ، ئەیەوێ بەم گیانە پەروەردەمان بکا، بۆیە لە شانۆنامەکەیا ئەنووسێ : « ئاخ ! خوا ڕۆژێك بڕەخسێنێ کە هەر شارێك خوێندەواریی تێبکەوێ • هەموو بزانن کە خۆشیو قەدری ئینسان بە حورمەتی قەومو ئاوەدانیی نیشتمانیەوەیە ، ئەگینە ئێستا من بڵێم : وەتەنپەروەرم ، درۆ دەکەم • هەموو بۆ دەبدەبەو ناوو شوهرەتی خۆم بەگژ عەشرەتەکانیتردا دەچم • لەبەرئەوە گەورەی عەشیرەتەکانیتر دیارە نایانەوێ من بیم • هەرکەسە بووەتە دزی گای خۆیو ، هەریەکە بووەتە ملۆزمی فەقیرو هەژاری قەتعەیێك • هیچکەس نابینم جوزئی مەنفەعەتێکی خۆی بۆ مەنفەعەتێکی زۆری عومومی فیدا بکاو ، تا هەرکەسە بۆخۆی بێ بە هیچ نابێ ، با ئەمرۆیش بڵێن پارەدارە خۆشیانئەوێ • سبەینێ کە خوێندەواری چاوو گوێی میللەتی کردەوەو زانیبان هەر بۆ خۆیەتی ، ئەو قەدرەی نامێنێ » •

* * *

پیرەمێرد لە ڕزی قسەکانیدا بە ناوی مەحموودئاغاوە لەگەڵ پەرچیهرەیێ خێزانی دواڕۆژی ، ڕایەك ئەخاتە ڕوو پوختەکەی ئەچێتەوە سەر ئەوە کەسێك لەبارەی کۆمەڵایەتییەوە لە بەرەی ئەوانە بێ جەماوەرێ ڕەشورووت ئەچەوسێننەوە ، بۆئەوە دەسنادا ئەرکی پێگەیاندنو ڕزگارکردنیان لە چەوساندنەوە بگرێتە ئەستۆ ، چونکە ئەو پێگەیاندنو ڕزگارکردنی خەڵکە لە قازانجی خۆی نیە • کەواتە ناتوانێ ئەو ئەرکە

بەدی ئینیّ . ئەوەتە پیرەمێرد بە زمانی مەحموودئاغاوە ئەڵێ : « ئێستا من کە مەوقیعێکی بلندی عەشیرەتیو حوکوومەتیم هەیە ، پیم نا لێ عەرەبی ئیسلاحی ئەم قەومە بدەمو ، ئەگەر ڕاستیشت دەوێ بە تینم دەستنادا ، چونکە ئەم خەڵکە ئەگەر تێگەیشتوو بن ، بۆ من دەست نادەنە تفەنگو بۆم بچن بەگژ لەشکری دوشمنی منداو ، ئەم خاکی ئێمەیش خوا ئاوەکەی وا بۆ ڕشتووە هەموو عەشائیر دوشمنی یەکین و لە حودوودیشداین ، لەبەرئەوە بۆمان ناکرێ ئەم ئەهالیە سەوقی سەر خوێندەواری بکەینو لەدەست خۆمانی بکەینەوە . ئەمە مەسلەکی ناچاریە ، یەعنی من بمەوێو نەمەوێ دەبێ هەمیشە سێسەد چوارسەد تفەنگم ئامادە بێ ، ئەگەرچی ئەمە حەیاتێکی وەحشەتە » .

ئەمەی پیرەمێرد ئەیڵێ دوو خالی وردی تیایە ، یەکەمیان لە کرۆکا لەگەڵ یەکێ لە بنەماکانی بیری سۆشیالیستی یەکئەگرتەوە . ئەو یەکگرتنەوەیش لەوەدایە لە بیری سۆشیالیستیدا ئەرکی ڕزگارکردنی کۆمەڵ لە ڕژێمی چەوساندنەوەی چینایەتی بە چینی کرێکار سپێرراوە ، چونکە ئەم چینە تاقە چینێکە ئەگەر نەشێوێنرابێو لەخشتەلەبرابێو باری چینایەتیی ڕاستەقینەی خۆی بفامێ ، هیچ سوودێکی لە چەوساندنەوەی هیچ کۆمەلە خەلکێکا نیە ، بۆیە کە دێتە مەیدانی ئازادکردنی کۆمەلەوە بەڕاستی دێتە مەیدانەوە .

دووەمیشیان ئەوە کە مرۆ ڕۆڵەی ئەو ئاووهەوا کۆمەڵایەتیەیە تیا پەیدا بووەو تیا پەروەردە بووەو ، ئەگەر کارایەکی لاوەکی نەیەتە پێشەوە ڕەوتی ژیانی پێ بگۆڕێو بیخاتە سەر ڕێگایەکی نوێ ، خۆی بە ناچار ئەبینێ هەر لە چوارچێوەی ئەو سوودو قازانجانەدا بسووڕێتەوە کە بارو دۆخی ژیانی ڕەنگی بۆ ئەڕێژێ ، بەڵکو لەوە زیاتر قازانێ .

هەروا پیرەمێرد کە ئەم بیرە بە زمانی مەحموودئاغاوە دەرئەبڕێ

سەرەنجام ئەیشیکا یە بەلگەیەکی‌تر بۆ ڕەوایـی ئـەو باوەڕەی بووە بـە سەرچاوەی دیاری‌کردنی زۆر لەو هەلوێستانەی لە ژیانی خـۆیا ناونـی‌و باوەڕێکی پتەوو جێگرتووی پێ بووەو ئێمەیش یەك دوو جار لەم وتـارەدا پەنجەمان بۆ درێژ کردووە ، کە ئەویش باوەڕی متمانەنەکردنە بە چاکبوونـی ڕاستەقینەی بارو دۆخی کۆمەل ، مەگەر بەئاستەم‌و لەسەرخۆو لەئەنجامی گەشەکردنی هێدیی هەموو ڕووەکانی ژیانی کۆمەلدا . ئەوەتـە دوایـی قسەکانی لەگەل پەریچیهرە بەوە دێنێ کە ئەلێ : «جا ئەگەر خوا بەزەویی بە مندا بێ‌و ڕەفیقەیێکی دلسۆزم بداتێ هیچ نەبێ بە شەو کە فەراغەتێکمان بوو دەردی دل لای یەك هەلئەڕێژین‌و تەسەللایێکمان بەیەکتری ئەبێ‌و ، ئەگەر خوایش پیدا ، ئەولادمان ببێ ، بەپێی دلو دەروونـی خۆمـان پیهێنینـــە بەرهەم» .

بەلای منەوە ئەم ڕستەیـەی پیرەمێـرد ، بـە زمانـی مەحموودئاغای شـیوەکـەلـەوە ، لـە چـوارچێـوەی دەمـەتەقێی نێـوانی مەحموودئاغاو پەریچیهرەی خێزانی دواڕۆژیا ، لە تێکـستی شانۆنامەکەیای گونجاندووە ، بەبێ‌پێچوپەنا وائەگەیەنێ باوەڕی وابووە باری کۆمەل هەرگیز بە قەلەمباز نا ، بەلکو وردەوردەو لەسەرخۆ ڕاست ئەبێتەوەو ، پێویستی بە گۆڕانـی ئاستی تێگەیشتوویی‌و پێگەیشتوویی ئەندامانی کۆمەلە . جا کـە ئەمـە وابوو ، ئەبێ پیرەمێرد لایشی وابووبێ مـادەم کۆمـەل لەخـۆیا ئامـادە نەبووبێ بۆئەوەی باری لاری ڕاست ببێتەوەو ، لەگەیشتبێتە ئاستی ئامادەیی بۆ گۆڕانی دەسەلاتدارێتی یا جۆری ڕژێمی کۆمەلایەتی بە یەکێکی‌ترو ، مەسەلەی تەقـەلای گۆڕینەکە یا لەگـەل بەشداری‌کردنـی کۆمەلاتێکـی فراوانی خەلکیشا بێ ، لە کرۆکا هەر لە سنووری دەستەیەکی کەمـی لـە بیروبۆچوونی خەلکەکە دابڕاودا بێ ، ئەگەر ئەو دەستە کەمە ئەوەیشیان بۆ بڕەخسێ کە دەسەلاتدارێتی یا تەنانـەت خودی ڕژێمـی کۆمـەلایەتـی‌یش

بگۆڕن بە ڕژێمێکی بەدیمەن لەپێشتر ، لەڕاستیدا شتێکی ئەوتۆیان نەکردووە ، چونکە لە سوورەی گۆڕینی تەنها دەسەلاتدارییا هیچ لە خەلکەکەدا ناگۆڕێ و ، لە دەسەلاتدارێتی خۆشیا تەنها دەموچاوو سەروسیما گۆڕاوەو ، کەمجار وائەبێ دەموچاوە نوێکە جیاوازییەکی ئەوتۆی لە دەموچاوی پێشوو بێ ئەندازەیەك کار بکاتە هەندێ سەری باری ژیانی خەلکەکە • لە سوورەتی گۆڕینی ڕژێمیشا ، مادەم گۆڕینی ڕژێم پێویستی بە بنکەیەکی بەربلاوی ئەوتۆی جەماوەرییە بۆ جێگیرکردنی ڕژێمی نوێ لەجێی ڕژێمی پێشوودا تێیکۆشێ و ئەو بنکەیەیش نییە ، دیسان ، با هەندێ شتیش بەدیمەن و ڕووکەش بگۆڕێن ، ناخی کۆمەڵ هەر ناخەکەی جارانەو شتێکی ئەوتۆ نەگۆڕاوەو ، زوو بێ یا درەنگ ، کار ، لە ڕووی نەگۆڕانی کرۆکەوە ، ئەگەڕێتەوە سەر دۆخەکەی جارانی یا شتێکی نزیك لەوەو ، هەر ئەبێ چاوەڕوان بین کۆمەڵ لەسەرخۆو لەبنەوە گۆڕانی بەسەرا بێ و ، لە حالەتێکەوە بچێتە حالەتێکیترو ، وای لێبێ بەڕاستی پێویستی بە ڕژێمێکی نوێ بێ •

بیرو بۆچوونیوا زۆر جار قسەی تاڵو سەرزەنشتی ناواقیعیی لە هەندێ لە لاوانی نیشتمانپەروەری خوێنگەرمی کەمتەجرەبەوە هێناوەتە ڕێی پیرەمێرد ، بەلام سەرەنجام بۆ ئەو لاوانە خۆشیان دەرکەوتووە تێکڕا بیگری ئەو لەسەر هەق بووە نەك خۆیان ، بەلام کەسیان بە خۆی نەزانیوە کە مەسەلەکە وایە تا کاتێ کە یا لەبەر لەکارکەوتنی خودی خۆی ، یا لەبەرئەوەی بارو دۆخەکە وا نەماوە هەمووکەس بتوانێ پەلی تیا بهاوێ ، توانی ئەوەی نەماوە هەڵوێستی خۆی ڕاستکاتەوە •

* * *

پاش ئەم هەموو باری سەرنجانەی پیرەمێرد بە زمانی مەحموودئاغاوە دەری بڕین ، سەرە دێتە سەر ئەوە بە زمانی پەریچیهرەیشەوە شتێ بلێ . لەم مەیدانەیشا دێتە سەر شیکردنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی باری ژیانی ئافرەتو ، بە زمانی ئەمیشەوە وا دەرئەبڕێ کە ئەمیش هەر لەوباوەڕەدا بێ لە ڕێگای پێگەیاندنو ئامادەکردنی وەچەی دوارۆژەوە نەبێ بۆ تێگەیشتنی پێویستیی گۆڕینی کۆمەڵ ، باری لاری کۆمەڵ ڕاست ناکرێتەوە . ئەمیش بۆ دابین‌کردنی وەدەست‌هێنانی دوارۆژ پشتی هەر بە پێ‌خوێندنی وەچەی نوێ ئەستوورە : «... ئەگەر لە مێردم پشت‌ئەستوور بم عوودیش لێ‌ئەدەمو گۆرانی‌ش ئەلێم . نیهایەت پێم‌ئەلێن «سۆزانی» ، خۆ هیچ نەبێ ئاسارێکی سەنایعی نەفیسەو جەسارەتێکی مەدەنی‌یە دەخەمە ناو جینسی لەتیفەوە . ئەو لەونە ، یەعنی ئەم حورڕییەتە بەکەلکی کەس ناشێ . کەواتە ئەگەر هەر بە کچێنی لە ماڵی باوکدا بمێنمەوە ئەم حیسیاتە ئەخەمە بن گوێزی سیاگوێزەوە دەینێژم ، بەڵام تا پێم‌بکرێ کچان کۆدەکەمەوە ، بە ڕۆژ جزمیان بۆ دەنووسمەوە ، فێری خوێندنیان دەکەم ، ئەوسا بە خوێندەواران سوپای خۆم وا ڕێکدەخەم کە ڕۆژێک بێ لەشکری نادانی بشکێنن » .

لێرەدا سەرنجی خوێندەواری ئازیز بۆ پیشاندانی چۆنیەتیی تێگەیشتنی ئەو سەردەمە(و بەڵکو تاڕادەیەکیش ئێستا )ی جەماوەر لە هونەرو ، بۆ هەڵوێستی لە هەڵسەنگاندنی هونەرمەندانو ، بۆئەوەیش ڕائەکێشم کە پیرەمێرد چۆن ئەیەوێ بە زمانی کچە ئاغایەکی لادێیەکی ڕەقەڵی وەک سیاگوێزەوە خەڵک لە باری ڕاستی مەسەلەکە بگەیەنێ . هەروا سەرنجی بۆ وردبوونەوەیش لە باوەڕی پتەوی ئەو کچە ڕۆشنبیرە تەبەزو کۆڵنەدەرە بە دوارۆژ ، بە بێ گومانیی ڕەوپێکردنی لەشکری تاریکی‌و هەڵهاتنی خۆری گەشی جیهان‌گرەوەی خوێندەواری ڕائەکێشم کە

پیرەمێرد بە سەرچاوەی یەکەمی هەر باری لار ڕاستکردنەوەیەکی کۆمەڵەی کوردەواریی ئەزانێ • ئەم وردە لاکردنەوەیە بەلای ئەم جۆرە بابەتانـەدا ، بایەخێکی گەورەی لە تێگەیشتنی بیری پیرەمێردو لە پایەی مەحموودئاغای شێوەکەڵو پەرچیپەرەی خێزانی لە مێژووی لایەکی چەکەرەکردنو گۆڕکە دەرکەوتنی بیری شارستانەتیی نوێ لەناو کۆمەڵەی کوردەواریدا هەیە •

جا کە پەرچیپەرە لەم بەشەی قسەکانی ئەیتەوە ، ئەمیش وەك زۆر کەسی دڵپاکی دڵسۆز لە وڵاتە پاشکەوتووەکاناو لە سەرەتای گەیشتنی بیری نوێدا بەو وڵاتانە ، کە ئەکەونە دۆزینەوەی چارەی میساڵیانەو خەیاڵی بۆ تیمارکردنی دەردە زۆرو زەبەندەکانی کۆمەڵەکەیان ، پێشنیای وایان بەخەیاڵا دێ نە بۆئەوە ئەشێ لە سنووری چەند کەسێکی کەللەگەرم زیاترا بهێنرێتەدیو ، نە ئەگەر لەو سنوورەیشا هێنرایەدی کەڵکێکی ڕاستەقینەی لێ ئەوەشێتەوە • ئەوەتانێ پەرچیپەرە بە مەحموودئاغا ئەڵێ : ئەگەر ڕێکەوتو خواستمتان لە باوکمو بووم بە دەزگیرانت ، ئاگاداربە «ژنان هەردوو لامان ماڵوێران ئەکەن • دە دەست قەنەوزو شەش دەست مەخمەڵو چیتۆکەو پیتۆکە لەوناوەدا لەتوپەت بکەنو ، هەردوو لا پارە بخەینە گۆمەوە • من کە بووم بە کەبانووی ماڵی خۆم ، خۆم جل بۆ خۆم دەکەمو ئەو پارەیە ئەدەم بە ئەهالیی فەقیر کە لەژێر باری سەلەم یتەدەرێ» • خاڵی بایەخدار لەم پێشنیایەی پەرچیپەرەدا هەستکردنیەتی بە باری گرانی خەڵکی کەوتووە ژێر سوودو سەلەمو سەوزخۆری بازرگانانی شارەوە • ئەیشگونجێ پیرەمێرد کە ئەم پێشنیایە بە زمانی ئەوەوە ئەخاتەڕوو ، زمانی مەبەستی جەختکردن بێ لەسەر خراپیی دابونەریتی جلوبەرگی زۆرو زیادە بۆکردنی بووك ، لەگەڵ لاپێکردنەوەی خەڵکیشا بەلای چینی کشتوکاڵکەرانی لادێوە کە لە چباروودۆخێکا ئەژین •

* * *

له کــوڕی خولزێنیــی پەرێچیهــرەدا لە ئەحمــەدبەگــی باوکی بــۆ مەحموودئاغا ، پیرەمێرد لە کەرانەوەیەکا بۆ ئەو دوو بابەتەی پەرێچیهرە لە دوادوایی دیدارەکەیا لەگەڵ مەحموودئاغا هێنانیە ئاراوە ، ئەحمەدبەگو سلیم‌ئاغای باوکــی مەحموودئاغاو مەحمــوودی ڕۆستــەم‌ئاغا ناوێــك کــە دیارە یەکێکە لە ئاغاکانی ناوچەکە ، ئەخاتە کێشەوەو ، هێمایەکی زۆرەکانە بۆ ئــەوە ئەکا کــە چەکــەرەی هەڵوێســتی نوێخوازانــە لە گیروگرفتــە کۆمەڵایەتی‌یەکانی ژیان لەناو ئاغەواتی ئەو ناوچەدا ڕیشەیەکی دوورتــری لەوە بووە کەلە دەمەتەقێی نێوان مەحموودئاغاو پەرێچیهرەدا دەرکەوتووە •
من بە دووری نازانم ئەمە بەرهەمی سەرسنوورکەوتنی ئەو ئاغایانەو کەڵك وەرگرتنی ئازادانەیان لــە کەلەپووری شارستانەتیــی نــوێ بووبــێ کــە وەك‌یەك بە وڵاتی عوسمانیو ئێرانیش گەیشتووەو ، ئەوانیش ئازادیرانە مامەڵەیان لەگەڵ ئەم کەلەپوورە کردبێ •

مەسەلەکەیش بەم‌جۆرەیە :

کە سەلیم‌ئاغا خوازبێنیی پەرێچیهرە لە ئەحمەدبەگــی باوکی ئەکا بــۆ مەحموودئاغای کوڕی ، ئەحمەدبەگ بەم‌جۆرەی وەڵام ئەداتەوە : « میرم ! ئەگەر پەرێچیهرە پەریی کێوی قافیش بێو نەوەی شابالشایش بێ، شاباشی بەرێی مەحموودە • وا بە کراسی بەری خۆیەوە دەینێرم • زاتــەن خــۆی وتوویە کاتێ بمدەن بە شوو من جلوبەرگ ناکەم • بە کراسی بەری خۆمەوە دەچمە ماڵی مێرد ، لەوێ جل بۆ خۆم دەکەم » •

سەلیم‌ئاغایش ئەڵێ : « میرم ! من ئەم فکرەی پەرێچیهرەم زۆر لــەلا باشە ، ئەگەر خوا بکا ئەم جەسارەتە بنوێنێو ئەم بیدعەتە سەییئەیە لەنــاوا هەڵگرێ ، ئاسارێکی تەئریخی‌یە ، چونکــو ئەبینیــن باوکێــك‌و کوڕێــك هەردوکیان ساڵەها ڕەنج‌ئەدەن ، شەش حەوت لیرە کۆدەکەنەوە ، دەیانەوێ ژنێك بۆ کوڕ بێنن • ئەبێ لەپێشدا ئەو پارەیە بدەن بە قەنەوزو خارای کا

له ولاتی بێگانەوە دێت ، بیکەن بە جلی بووك کــە تەنهــا ســێ شــەو لەبەردەکرێ • ئەنجا کە پارەکەیان لە جلدا خەرجکرا ، بۆ نانی شایی دەبێ ســەلەم بکەن • سەلەمیش وەك ڕەگی گولی یا خۆرە وایە ، ئیتر لەکۆلیان ناکەوێ » •

ئەنجا « مەحموودی ڕۆستەمئاغا ڕووئەکاتــە سەلیمئاغــا ، ئەڵــێ : ئۆف •• ئۆف هەر ئەمەمان مابوو کچێك هەڵــێ بڵێ من عادەتی باوباپیرتان ئەگۆڕم ، شاییتان لێ حەرام ئەکــەم ، جلەبــووکو خەنەبەنــدانو پــلاوی شاییو جیــازیو ڕەشبەڵــەك ناهێڵــم • نەخــوازەڵا چــوار مــسکێنمــان بەدەستەوەیە بە سەلەم پارەیان ئەدەینێ چوار باتمان توتونمان بــۆ بکەن ، ئەویشمان لە دەست بکاتەوە ، ئیتر بمانکاتە گاگەل بلەوەڕێنین » •

با لەم تابلۆ چڕوپڕەی پیرەمێرد وردبینەوەو سەیرکەین چــۆن لــە پیشاندانی پێشنیاکانی پەرچیهرەدا مەسەلەکەی ، سەرەڕای هەموو ڕووە دزێوەکانی کە پەرچیهرە خۆی پیشانی دابوون ، بە مەسەلەی نیشتمانیو هەڵوێست لە کومپانییە بازرگانییــە تالاَنکەرەکــانی بێگانــەوە بەســتو دەریخــست کە کڕینی ئەو هەموو جلوبەرگە زیــادە بەنــاوی بووکــەوە ، کۆتەکێکیشە ئەمــرەوێنرێتە قــەبرغــەی ئابووریی نیشتمانیو ، بەوجۆرە سامانی ولاَت دائەهێلرێتە ناو گەنجینەکانی ولاَتانی بێگانەوە • هەروا چۆنا هەستی چینایەتیی لەدژی جووتیاران لای دەرەبەگێکی سوودو سەلەمخۆر پیشانداو ، دوارۆژی چینەکەی ئەو دەرەبەگەی بەست بە مانەوەی سوودو سەلەمەوە ، ئەگینا سەرەنجامی دەرەبەگی لادێیش وەك مــسکێنێکی هەژار ئەبێ کە ئەبێ بە ڕەنجی شانی خۆی بژی ، ئەویش بە گاوانی ، چونکە هیچ کارو پیشەیەکیتری لێ ناوەشێتەوە ••

پیرەمێرد پاشئەوەی لە بەشی یەکەمی ئەم تابلۆیــەدا دوو لایەنــی پێچەوانەی بیروباوەڕی یەکتری لە کۆمەڵدا پیشانداو تێیگەیانــدین کەوا

ڕاستکردنەوەی لاریەکانی کۆمەڵ کاری نییە بەسرایی بە ئارەزووی ئەمۆئەوەوەو ، ڕەوا نییە لایی هەر بۆ سەرکەوتنی بیرو بۆچوونی خۆی خەتێکی ڕاستوچەپ بەسەر هەموو لاکانیترا بێنێو ، تەنانەت ئەگەر بەتەواویش دلنیا بێ لە ڕاستیی خۆیو هەلەیی بەرانبەرەکەی ، هەر ئەوە باشترە لێگەڕێین گۆڕانی لەسەرخۆی کۆمەلایەتی باری لارمان ڕاستکاتەوەو ، پاشئەوە دێ لە بەشەکەیتریا هەموو لایەنەکانی کێشەکە بە ئەحمەدبەگی باوکی پەریچیهرەیشەوە کە لە تابلۆکەدا نیمچە بێدەنگی بوو ، بەمشێوەیەی بنەوە یەکئەخاو ڕادەیەك بۆ ئاکۆکییەکەیان دائەنێو ، بە هەریەك ئەوەندە ئازادی ئەدا کە لە سنووری تێکنەدانی مافی ئازادیی یە ئارەزووی خۆ هەلسووڕانی ئەوانیترا چیی لا باشە بیکا • ئەوەتە ئەلێ : « سەلیمئاغا جواب [جوابی مەحموودئاغا] ناداتەوە ، ڕووئەکاتە ئەحمەدبەگ ئەلێ : لە شوکرانەی ئەوەدا کە کوڕو کچیوامان هەیە ، با ئێمە بەم پیرییە شاییو هەلپەڕکێ بکەینو مەلایش مارە ببڕێ • دوایی پەریچیهرەو مەحموود بە جووتەسوارە هەلسن بچنە مالی خۆیان لەوێ چی بە چاك ئەزانن بیکەن • بەلام مەولوود نابێ تەرك بکرێ • با ئانی شایی نەبێ ، مەولوود بێ » •

ئەمەبوو لەم تابلۆیەدا پیرەمێردی سیاسەتمەدار • لە بیرو ڕای پەریچیهرە بەشێك ، لە هەلوێستی مەحموودی ڕۆستەمئاغا بەشێك ، لە تاقیکردنەوەی پیرێکی وەك سەلیمئاغایش بەشێکی جێبەجێ کرد • ئەو بەشەیش کە کێشەیەك بوو لەوە گەورەتر بوو بە بیرو بۆچوونی دوو سێ کەس ببڕێتەوە ، لێیگەڕا بۆ دوارۆژ خاوەنمەسەلەکان خۆیان بڕیاری خۆیانی تیا بدەنو ببڕنەوە ، ئەوڕۆژەی کە ئاستی هوشیاریی لادێیی ئەگاتە ڕادەیەك بتوانن لەڕووی ئاغادا ڕاپەڕنو بلێن : ئاغا ! ئیتر نا •• ئیتر بەس •• ئەو سەردەمە بەسەرچوو کە هەمووشتێ بە ئارەزووی تۆ بێ •••

* * *

تا ئێرە ڕووە گەشەکەی ئەو خەیاڵە خۆشانە بوو کە پیرەمێرد بە زمانی کەسەکانی (پیەسی تەمسیلە ڕاستە تەئریخیەیە لە وڵاتی خۆماندا ڕوودداوەکە)یەوە ، بۆ دابین کردنی ئەرکی پیرۆزی پێشخستنی گەلو نیشتمان بیری لێ کردنەوەو ڕەنگی بۆ ڕشتین . بەلام کاروبار نە ئەو سەردەمە بەئاسانی بەڕێچووەو نە ئێستایش هەروا بەئاسانی بەڕێوەئەچێ. کەم نەبوونو کەم نین ئەو هێزە ناوخۆییو لاوەکیانەی بوونو ئەبن بە گابەردی سەر ڕێی ڕێبواری ڕێگای ئازادیو ، بە دڕکەزیی ئێوان مەمو زینانی عەودالو شەیدای خۆشبەختیو کامەرانی .

وەك لە سەرەتای ئەم باسەوە ئیشارەتمان بۆ کرد ، کەسانیوا نایابو بەلکو کەمایش نەبوون کە بۆ پاراستنی سوودی خۆیان هەزار گەلو نیشتمانیان لا ئەوەندەی لێرەیەکی زەرد قیمەتی نەبوەو ، بۆ مسۆگەرکردنی بەئیجارە وەرگرتنی دوو لادێو ڕووتاندنەوەی بەری ڕەنجی ساڵانەی دێهاتیە ڕەشوڕووتەکانیان نە خوایان لەبیر بووەو نە گەلو نە نیشتمانو نە وژدانو نە دەروون ..

هەندێ لەم جۆرە کەسانە ، لە ڕووداوەکانی ئەم شانۆنامەی پیرەمێردا ، دەسەڵاتی داگیرکەری عوسمانی تێئەگەیەنن کە مەحموودئاغای شێوەکەڵی قایمقامی شاربازێڕی لەلایەن عوسمانیەوە دانراو ، لەدووی سوودی تایبەتیی خۆی ئەگەڕێو بۆ خۆی هەڵئەسووڕێو ، موتەسەڕیفی سەردەمیش ـ کە ئەو خۆیشی هەر یەکێك بووە لەو لەدووی قازانجی خۆ گەڕاوانەو بایی پوولێ قازانجی بەرزو دووری دەوڵەتی مەبەست نەبوە ـ ئەکەوێتە دوای ئەم درۆو دەلەسانەو ، ئەنجومەنی لیوا خڕئەکاتەوە کە برێتی بوون لە هەیئەتی ئیدارەی لیواو شێخ سەلامی قازیو مەلائەحمەدی چاوماری موفتیو ، ئەم دەمەتەقێیە لەبارەی ڕازو نیازی مەحموودئاغاوە لەنێوانیانا ڕووئەدا :

« موتەسەڕڕیف : هەیئەتـی موحتەرەمـە ! ئێمـە لـە حودوودا قائیمەقامێکمان هەیە مەحموودی سەلیم ئاغـا • ئەم زاتـە هەرچەنـد بـە خواهیش و ڕەمزای دەولەتی نەبوە بە قائیمەقـام و ، بە زۆرو جەسـارەت و قووەتی عەشرەتی خۆی حوکوومەتی شارباژێری گرتووەتە چنگ خۆی و ، ئەستەموولیش بە ئیجابی سیاسەتێکی زەعیف لە هەموو حودوودێکدا ئەم نەوعە زۆردارانە ئیستیخدام دەکاو تەسدیقی قائیمەقامیی ئەوی کـردوەو بە ئیرادە تەعیین کراوە ، ئێستا نەك تەنها شارباژێر ، پەلی هاویشتۆتە ئۆلکەی ئێرانەوە • حاکمی بانەیان دەرکردووەو یۆنس‌خانی خزمی خۆی کردووە بە حاکم و ، بەوەیش دانامەزرێ ، لە سەقزیشدا هەرچـی ئـەوو یۆنـس‌خان نەیانەوێ ناکرێ • دەولەتی ئێرانیش لەم بابەتەوە شکاتی کردووەو ئێستـا ئێمەیان مەجبوور کردووە کە ئەو زاتە لەوێ نەهێلین • ئێوە ئەڵێن چی ؟

« ئەعزای بێ ناو : پاشـام ! ئێمـە سالهـای سـاڵ بەدەسـت زولـم و تەعەددای دەرەبەگیەتیی بابانەوە هیلاك بووین تا خـوا ئەوانـی لەسـەر هەلگرتین • لە تەئریخی ١٢٦٦ی هیجری‌یەوە کە ئـەووەڵ موتەسەڕڕفـی دەولەت ئیسماعیل پاشا هاتووە توانیومانە بڵێین زیندەومرین • ئێستـا ئەم مەحموودئاغایە لە بابان زاڵمترە ، دارو فەلاقەی هەیە • لـە هیچ دەولـەتێ ناپرسێ • تەبەعەی هەر دەولەتێ لەوێدا بێ خەرجی لێ دەسێنێ• بێ‌پرسی قونسلۆسی جەزای لێ دەسێنێ • خەریکـە سەرلەنـوێ حوکوومەتێکی کوردی پێبێنێ ناو • بە حوکوومەت دەڵێ ڕۆمی •••

« موتەسەڕڕیف : ئافەریـن ! تۆ پیاوێکـی سادیقـی دەولەتـی و تێگەیشتووی کە ئیدارەی زۆردار (ئانارشی)و بێ‌قانوونی‌یە ، عەدالەتی تیا نابێ • تەفرەی خەڵك ئەدەن : هەی ئێمە وەتەنی و میللی و نازانم چی و چین ، کەچـی لەپێشـدا هەرچـی پیاوێکـی بەناموسـە لەناوی ئەبـەن یا لەدەستی دەخەن ، هەرچی و پەرچی دەخەنە کار •

« موفتی : پاشام ! مەسئەلەی تەشکیلاتی حوکوومەتیو ئیدارە زۆر موهیمە ، باخوسووس تەرتیبی حودوود ، پادشاهانو وەزیرە مەشهوورەکان کردوویانە ، تەماشای تەئریخ بکەن دەولەتی عوسمانی چ بە عەدالەتو چ بە قووەت لە هەموو حوکوومەتی ئاسیا پێشتەرەو ، تائێستا ئیستینادی قووەتی هەمیشە بە عەشیرەتو تیمارو زەعامەت بووە ، واقیعەن سولتان مەحموود عەسکەری تازەی هێنایە مەیدان ، بەڵام بڕوانن لە سەراوردی تەئریخیدا شەڕی هەموو حودوودی شیروانو ڕەوانو چالدیرانو فەتحی بەغدای سولتان سولەیمانو مرادخان هەموو بە قووەتی عەشائیری ئێمە بووە ، هێچگار لە حودوودا دەولەت بۆی مومکین نابێ هەمیشە ئۆردووی عەسکەر دابنێ ، ئەم نەوعە کەسانە دەکا بە قائیمقام قووەتی ئۆردوویێکی پێدێنێتە بەرهەم ، بۆچ شوکری خوا ناکەین کە لە حودوودا ئێمە ژێرکەوتە نین ! بارەها دیومانە کە هەمحودوود دەستی بەسەرمانا بووبێ چۆن پەتی بۆ هەڵخستووین ، ئێستا مەحموودی سەلیم شێوەکەڵی لە حودوودا ئاسایشی تەئمین کردووە ، خەرجوباجی حوکوومەتی هەمووی تەسلیم بە سندووق ئەبێ ، مسکێن تەنها یەك شەخسێ دەناسێ ، والی یە هەر حەیتەیەك بچێتە دێیەك حوکمدارێ بێ نانو ئالیكو پێخەفو هەموو چشتێك بەخۆڕایی لە مسکێن بستێنێو ، کە پارەی خەرجی لێوەرگرتن بیخواو بەقایا بەسەر دێهاتەوە بمێنێتەوە ، ئێستا بەڕاستی ماڵو عەرزی مسکێن لە ئەمنیەتدایە ، کە تەنها شەخسێ بێو کەسێکیتر نەتوانێ دەستدرێژی بکا ، ئەو تەنها شەخسە سەهلە ، تا ئێستا مەحمموودئاغا چمسکێنێکی سەربڕی ؟ لە بانەدا دەستئەبڕن ، ئەوا فەرزمانکرد حوکوومەت مەحموودئاغای عەزڵکرد ، خۆ قودرەتو دەستەڵاتێ کە لەناو عەشائیرو حودوودا هەیەتی هەر ئەوەو تا ئەو مابێ قائیمقامی لاوە ناتوانێ لە شاربازێڕدا حوکم بکا ، بەڵێ ئەتوانن مەرکەز بهێننە سەری ئەزمڕ یا

هەڕووتە کە لە شارەوە چاویان لێیە ، بەڵام لە هەر دێیەك دانیشن حوکمیان تا حودوودی ئەو دێیە دەبێ ۰ئێستا حوکوومەت لە خاکی ئەجنەبیدا بەقەد خۆی حوکم‌و نوفووزی هەیە ۰

« شیخ سەلام : پاشام ! ئەم فکرە دەربارەی مەحمـوودی سەلیم‌ئاغا لەتەرەف ئەو ئەشخاسەوە ئیلقا کراوە وادەزانن ئەگەر مەحموود نەبێ ئەمانە هەریەکـە لـە شارباژێڕ چەند دێیەك ئیجارە دەکەن‌و ڕەزو بێستانیان گران دەخەرسێنن‌و بەقازانج دەگەن ۰ هەریەکە دەبنە ئاغای دێیەك ، پێکـارو بارەدارو هەرمومزو هێلکـەو مریشکیـان بەسـەر لادێییـەوە دەبـێ‌و خۆشیان هیچ فائیدەیێکیان بۆ حوکوومەت نابێ ۰ بەهۆی موساعـەدەی موتەسەڕڕیفێکەوە دەبنە سپلی لاورگ هەناسەی مسکێن دەبـڕن ۰ ئێستـا ئەگەر بە حەق تەماشا بکەین ئەم پیاوە لە هەموو قەڵەمڕەوی شارباژێـڕدا سەرخۆشی‌و قومارو دزی‌و زینای نەهێشتووە ۰ جەزای بۆ نوێژنەکەریش داناوە کە ئەساسی قووەتی سەڵتەنەتی عوسمانی دیانەتە ۰۰۰۰ نەسرەت لە دیانەتدایە ۰ قائیمقامێکـی سەرخـۆش دێ ، خۆیشـی ڕسـوا دەبـێ‌و ، حەیسی‌یەتی حوکوومەتیش نامێنێ ۰

« موتەسەڕڕیف : کەوابێ تا قیامەت ئەم پیاوە لەوێ قائیمقام بێ !

« قازی : جا ئەگەر مەئموور لە ئیستیقبالی خۆی ئەمین بێ‌و بزانێ تا خدمەت بکا عەزل نابێ ، چاکتر نی‌یە لەوە کە سەلەفی جەنابتان دەیفەرموو : ئاخ ! چیبکەم ۰ ئەگەر بمزانی‌یایە تا شـەش مانگ لێـرە دەمێنمـــەوە زۆر ئیشی بەئاسانم دەکردو هەر چوار دەوری شارم دەکرد بە باغ‌و درەخت ، ئەوسایە سلێمانی دەبوو بە بەهەشت ۰ بەڵام هەر واتزانـی یەکێکی‌تریـان لەشوێن ناردم‌و ، هەرچیش من بیکەم لـەو هەڵیدەوەشێنێتـەوە ۰ ڕاستـی فەرموو ، وەکی ئەم قائیمقامە سەرداری ئەکرەم هەڵبـژاردووە‌و هەمـوو

موتەسەڕڕیفانی سەلەفی جەنابتان زۆری لێ مەمنوون بوون • ئێستا ئێوە بناغەی ئەوان دەڕووخێنن •

« موتەسەڕڕیف : قازی ئەفەندی ! تەجاوز دەفەرموون • ئەمە تەرەفداری‌یەو بەرتەحریکم دەکەن •

« قازی : خێر ، پاشام ! بەیانی حەقیقەتە ، تەرەفداری نی‌یە • هەموو عالەم دەزانێ من لە حەیاتی خۆمدا موناسەبەتم لە لەم تیوەکەلی‌یان نەبوە • نیهایەت منیش عەلاقەداری عەدالەت‌و ئیدارەم • ئەوی بە خراپی بزانم مودافەعەی دەکەم • ئەمە موغایری قانوون‌و عەدالەتە بە بێ‌جورم مەئموورێکی بلندپایە ئیتیهام بکرێ‌و سەربەستیی حودوودو ئاسایشمان لەمێنێ •

« موتەسەڕڕیف : کەوابێ مەجلیس ختامی پێدرا • ئێوە بڕۆن • حوکوومەت کاری خۆی دەزانێ » •

وا لێرەدا پیرەمێرد ، جارێکی‌تریش ، بیری واقیع‌بین‌و وردی خۆی لە کەلێنی ئەم گفتوگۆیەی نێوان موتەسەڕڕیف‌و ئەنجومەنی حوزووریەوە بۆ خستینەڕوو • ئەو نەهات وەك هەندێ کەسی دلسۆزو دلگەرمی سەرچل‌و بێ‌تاقیکردنەوەو عەقل‌درشت کە لە ئیستیلاحی سیاسەتی پێشکەوتنخوازانەدا پێیان ئەوترێ تووشی « دەردی چەپڕەویی لە سیاسەتا منالی» بوون ، پیاوە بە سەنگ‌و ترازووی ئەوڕۆژە گەورەگەورەکانی کۆمەل ، پیاوانی وەك شێخ‌سەلامی قازی‌و مەلائەحمەدی مفتیی چاومار لە ریزی نۆکەرو خۆفرۆشتووانی ژێردەستی عوسمانیدا ریز بکا • جلخواری ناو مەجلیسەکەیشی کە بەناو بۆ سوودی دەولەتی عوسمانی‌و لەڕاستیدا بە ئارەزووی موتەسەڕڕیف ئەدوێ ، لە شێوەی کەسێکی ناکەس‌بەچەی کەس‌نەناسا خستەڕوو کە هیچ پێوەندێکی بە سوودی کۆمەل‌و ولاتەکەیەوە نی‌یەو ، موتەسەڕڕیف لەناو چلکاوخۆرانی کاسەلێسی بەردەرگای خۆیا

هەلیبژاردووەو کردوویە بە ئەندامی بەرێزی مەجلیس • ئەمە وێنەیەکی وردو دووربینی کاری سیاسییە ئەرژێتە ئەو ئاوەڕۆیەی بڕتییە لە پەکخستنی هەموو هێزە کارامەو پاکەکانی ناو کۆمەڵو نەهێشتنی تەراکەوتنی هیچ لایەکیان •

پیرەمێرد لەم بەشەی شانۆنامەکەیا وەك بلێی لەم سەردەمەی ئەمڕۆمانا ئەدوێ • ئەوەتە ئەوەیشی لەیادنەچوە ئەندامە کەسنەناسەکەی مەجلیسمان وا پێ بناسێنێ کە گوایە پێشکەوتخوازەو دژی دەرەبەگییەو ، مەحموودئاغای شیوەکەلیش بە جۆرە بەردەوامییەکی دەرەبەگیی بابانەکان دائەنێو ، وا پیشانئەدا کە دەولەتی عوسمانی بەهۆی پێشکەوتخوازیی خۆیەوەو لەبەر دەرەبەگایەتیی بابانییەکان میرنشینەکەیانی تێکدا !

پیرەمێرد لە دوادوایی شانۆنامەکەیدا هەنگاوێکیتریش بەنیازی دەرخستنی نیازپاکیو نیشتمانپەروەریی قازیو مفتی ئەنێ • ئەوەتە وا پیشانئەدا کە ویستوویانە مەحموودئاغا لە نیازی چەپەلی موتەسەرریف ئاگادار بکەن تا ئاگای لە خۆی بێو نەبێ بەداوەوە • بەلام لەبەرئەوەی رەنگی شانۆنامەکە بۆئەوە رێژراوە ئەو چەکەرەی هیوای کوردانە هەر لە خاکا وشك بێو دوارۆژی مەحموودئاغا بەوجۆرە بێ کە بوو ، نایگەیەنێتەجێ • با بزانین دوای بلاوەلێکردنی بەشدارانی مەجلیسی موتەسەرریف چی لەنێوان قازیو مفتیدا ڕوویدا :

« ••• قازی لە ڕێ [ڕێی گەڕانەوە] سەر دەنێتە بناگوێی مفتی ، دەلێ : ئەم باوەحیزە نیەتی خراپە • دەترسم مەحموود دەرمانخوارد بکا • چار چییە ؟ خەبەر بنێرن لەیەت •

« مفتی : قازی ئەفەندی ! فکرەکەت دروستە ، بەلام مەحموودئاغا هاتووەو لە کارێزی دایکی پاشا خێوەتی هەلداوەو گوێم لێبوو ، موتەسەرریف ناردی ئێوارە تەنها خۆی بێ بەیەکەوە نان بخۆین ،

کەسی‌ترم قوبووڵ نی‌یە • ئەلبەتە جاسووسیشی لەسەر داناوە • ئەگەر ئێمە یا خۆمان بچین یا کەسێ بنێرین دەیزانێ • منیش زۆر سەخڵەتم • سا بزانین خوا چی‌دەکا » •

ئەوی پاش هەموو ئەمەی کە وتمان پێویست بێ لەیادی نەکەین ، ئەوەیە پیرەمێرد لە مەیدانی دۆزینەوەی کەسێکیشا بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی نیازی دەرمانخواردکردنەکەی مەحموودئاغا ، دیسان هەروا دوو نموونە لەناو کۆمەڵا ئەخاتەڕوو • نموونەیەکیان نامەلاوە ناوێکە کە گفتی پەنجا لیرەی ئەدەنێ کارەکە جێ‌بەجێ بکا ، بەڵام قایل نابێ‌و ، لەبەرئەوە سوێندی ئەدەن‌و ئەیترسێنن کە ئەو ڕازە لای کەس نەدرکێنێ‌و ، نموونەکەی‌تریشیان خزمەتکارێکی خۆفرۆشی موتەسەڕیفە کە وەلی‌ئاغای قاوەچی‌یەو بە بیست لیرە تەسلیم بووە • دیارە لە کۆمەڵگای ئەو سەردەمەدا ڕەوشتی کۆمەڵایەتیی خەڵکەکە هێشتا ئەوەندە بۆگەنی نەکردبوو دۆزینەوەو بەکرێ‌گرتنی خۆفرۆشێك کارێکی هەروا سووك‌و ئاسان بێ !

* * *

من ( پی‌یەسی تەمسیلێکی ڕاستی تەئریخی ••) بە یەکێ لەو تێبانە دائەنێم کە لە مێژووی گەلانا بۆ ژیاندنەوەی شکۆی نەتەوەیی‌و بیناکردنی ژیانی نوێی گەل نووسراون‌و ، بە تایبەتی ئەم پی‌یەسە لەسەر بنەمایەکی هاوچەرخ‌و پێشکەوتنخوازانە داڕێژراوە •

من بە دڵ ئاواتەخوازم تیبە شانۆیی‌یەکانمان کە ئەڵێن تێکستی خۆماڵیمان نی‌یەو ، هەندێکیان عەودالی دوای تێکستی ئاماقووڵ‌و پڕوپووچ خولیزی بوون‌و دوای مۆدەی چاوەڕوانی‌کردنی هاتنی کەسالی وەك گۆدۆی هەرگیز نەهاتوو کەوتوون ، لایەك بە لای بابەتی وەك (مەحموودئاغای شێوەکەڵ)و (دوازدە سوارەی مەریوان)و بەیتی (قەڵای

دمدم)و ڕازو بەیتە میللی‌یە کلاسیکە زۆرەکانمان‌و بابەتی نوێی وەك ڕموتە مەزنەکەی حەقەکانا بکەنەوەو بەرهەمی شاتۆیی بەپێزمان لێ‌بانەوە بـۆ بهێنە بەرهەم • ئەمە کەمترین قەرزی ڕابوردووی پڕشانازیمـانە بەسـەر وەچەی هونەرمەندی نوێمانەوە •

* * *

لە ڕووی تەکنیکیشـەوە بە پێویـستی ئەزانم ئەم سێ ـ چوار تێبینی‌یە لە شاتۆنامەکـەی پیرەمێـــرد ، لە چاپەکـەی خۆیـا ، بخەمـە بەرچـــاوی خوێندەوارانی ئازیز :

١ ـ کتێبەکـە کۆمەڵێ هەڵـەی نووسینـی تیـایە کـە هەندێکیـان لەئەنجامی کەمیی هەندێ تیپەوە لە چاپخانەکەی پیـرەمێـردا ، وەك (ژ)و (گ)و ، هەندێکیان لەئەنجامی ناوردی لە نووسینەوەی دەسنووسی خراوە بەردەستی تیپ ڕێکخەرانی چاپخانە ، یا جێگیر نەبوونی ئـەو سەردەمـەی شێوەیەکی ڕاستی نووسینی کوردی‌یەوەدا ڕوویانداوە •

٢ ـ لە هەندێ شوێنیشیا هەڵـە لە چاودێری‌کردنـی گراماتیکـای زمانی ئەدەبیی کوردیدا ڕووی‌داوە •

٣ ـ هەروا هەندێ هەڵەی زەقی چاپیش کەوتووەتە کتێبەکەوە کە لە پەراوێزی تێکستەکەدا ئیشارەتم بۆ بەشێکیان کردووە •

٤ ـ شاتۆنامەکـە بەتـەواوی نەخراوەتـــە قاڵبـی شاتۆنامــەی ڕاستەقینەوەو ، لە گەلێ شـوێنیا شێوەی چیرۆکـی گرتووەتـە خـۆی • هەروا پێویـستی‌یـــە هونەری‌یەکـانی شێـوەی دابەشـکردنـی ڕستـــەی دەمەتەقێ‌و دەرخستنی کات‌و چۆنیەتیی دەمەتەقێ‌و شتی‌وای تیا پشت گوێ خـراوە ، کـە لام‌وایە پیرەمێرد ئـەوەی بەدەسەنقەست‌و بـۆیـە کردووە خوێندەواری ڕەمەکیی ئەو سەردەمەی کوردستانی عێراق ، کە ئـەو بـە

مەبەستی پێگەیاندنو پەروەردەکردن ڕووی دەمی تێکردووە ، توانی تەنها ئەوەی بووە لە چیرۆك حالی بێو شارەزای وردەکاریی شانۆنامەی هاوچەرخ نەبوە ٠

من ، بەر لە هەرچی ، مەبەستم ئەوەبوو تێکستەکەی پیرەمێرد بەوجۆرەی کە خۆی نووسیویەو لەچاپیداوە ، وەك میراتێکی بەنرخی ئەدەبی ، بخەمەڕوو ، بۆئەوەی وەچەی ئەمڕۆمان کە تاکوتەرایەکیان نەبێ لە چاپەکەی کاکەی فەللاح بەولاوەیان نەدیوەو ، ئەویش چاپێکی بێگەردو بێهەلە نیەو لەڕووی دەسنووسێکی هەڵەتێکەوتوو لەچاپدراوە ، چاپێکی ڕاستو دروستیان لە بەردەستا بێ ٠ جا ئەگەر شانۆدۆستانی کورد ڕۆژێ لەڕۆژان ویستیان ئەم شانۆنامەیە لەسەر شانۆ پیشانبدەن ، ئەبێ بەرلەوە سیناریۆنووسێکی کارامەو لێهاتوو کارەکەی پیرەمێرد بەتەواوی بخاتە شێوەی شانۆنامەیەکی هاوچەرخەوە ، بەلام بێئەوەی هیچکام لەو وشانە بگۆڕێ کە پیرەمێرد لە دەمەتەقێکانا بەکاریهێناون ، تا لە هەمانکاتا ئاووهەوای ئەو سەردەمەیش بێتە سەر تەختەی شانۆی ئەمڕۆمـــان ٠

# پی یەسی تەمسیلێکی ڕاستی تەئریخی
# لە وڵاتی خۆماندا ڕوویداوە


**پیرەمێرد**

**نووسیویەو ،**



**لە چاپخانەی خۆیدا لە سلێمانی لەچاپی‌داوە**

**نوسخەی (٣٠) فلسە**

**١٣٦١هـ – ١٩٤٢م**

Azady: M. Khuther

# پیەسی تمثیلیکی راستی تاریخی

لەولاتی خوماندا روي داوە

[پیرەمرد نوسیوە ولە چاپخانەي]
[خویدا ، لەسلیماني لە چاپي داوە]

نسخەي «٣٠» فلسە

١٣٦١ هـ
١٩٤٢ م

وێنەی لاپەڕەی یەکەمی چاپەکەی پیرەمێرد خۆی

( نوسخەی کتێبخانەی هەموانی سلێماني )

# ئـەم تەمسیلە چەند دەرسی تیایە

١ ـ عەدالـەت‌و ڕەعییەت‌نەوازیـی[١] مەحموودئاغـا نەهێشتبـوو ئیجارەدارو زۆردار دەست بکێشنە مسـکێن • ئەوانیش گیانی خۆیان بـۆ بەخت‌ئەکرد •

٢ ـ خوێندەواری لـەو بەردە ڕەقـەی شیوەکـەڵ‌و سیاگوێـزدا ، چ‌دەماغێـکی بە مەحموودئاغاو پەرێچیهرە دابوو •

٣ ـ مەسرەفی بێهوودەو هەوایی[٢] جلەبووك‌و شایی •

٤ ـ کچ کە بە ئارەزووی خۆی بدرێ بە شوو ، ماڵ‌و مێردی خۆی لا شیرینـــە •

٥ ـ حەسـوودی‌و فیتنەجۆیی قەومێك دەربارەی یەکتری ، چ‌لەوعە پیاوێکیان لەکیس‌ئەدا •

٦ ـ حوکوومەتێك کە فەرق‌و تەرجیحی عونسوریی کرد ، ڕوو لە نەهاتی‌یـــە •

---

(١) لە چاپەکەی کاکەی فەللاحا نووسراوە : « عەدالەت دەر عەیش نەوازی» ، وەك بڵێی ڕستەیەکی فارسی‌یەو ، ئەم ڕستەیە لە دێرێکی سەربەخۆدا کراوە بە ناونیشان بۆ پاشماوەی بڕگەکـەو ، « مەحموودئـاغا •• » کراوە بە سەرەتای دێرێکی نوێ • ئەم هەڵەیە لە دەستنووسەکەی لای منیشا هەیە ، تەنها ئەوەندە نـەبێ کە دێرەکـە درێـژە ئەکێشـێ‌و ، « مەحموودئاغا •• » نەکراوە بە سەرەتای دێرێکی نوێ ـ م •

(٢) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسـراوە : « هوایی » • من لێـرەدا پاش هێنانە سەر شێوەنووسینی نوێی کوردی ، تەنها (ی) پێویستەکـەی ئیزافەم لێ زیادکردووە • دیارە ئەمە بەمەعنای ( بەهەواو بەباچوو )وە • کاکەی فەللاح لە چاپەکەی خۆیا نووسیویە : « هەوای » • ئەگەر ئەوە ڕاست بێ ، دیارە واتە (ئارەزووی) ـ م •

## پەردەی نەووەن

### « پەردە هەڵدرایەوە »

سەلیم‌ئاغا دانیشتووە • مەحموودی ڕۆستەم‌ئاغای زاوای‌و مەحموود حۆمەری خەزنەداری لا دانیشتوون • ڕووئەکاتە مەحموودئاغا ، ئەڵێ :

**سەلیم‌ئاغا :**

مەحموودئاغا ! ئەمڕۆ زۆر بە واهیمەو بێقەرارم • یازدە ڕۆژە کوڕەکانم لەگەڵ ئەحمەدبەگی کەندەسوورد ڕۆیون بە یۆزس‌بەی کوڕی ئەحمەدبەگ لەشوێن کەریم‌خانی بانە دابنێن • لەولایشەوە شەرەفولمولکی والیی سنە ئەمانوڵڵاخانی کوڕی کەریم‌خانی داناوە لەشوێن باوکی ، چونکو ژنەکەی کەریم‌خان عیشوەبازێکە صەدی وەکوو خوسرەوخانی والی بە قسەی شیرین تەفرە ئەدا • والیش لەوانەیە کە هاتە سەر قین ئێلجاڕیی هەموو بەختیاری‌و عەشائیریان لێ‌بکا • جارێ قۆشەنی دیوانی هیچ لێیان ناترسم چونکو ئێمە یەکتر دەناسین • خوا بێ‌چاوێنی‌یان کا ، کوڕانی من ، هێجگار مەحموودو ڕەسووڵ ، لە سوپاهێ ناترسن • بەڵام بەختیاری بەڕاستی شەڕکەرن • ئەگەر لەشکریان بێتەسەر ، ئەبێ تەنگچیی ئالان‌و بەرکێویش دەنگ‌بدەین‌و خۆیشمان بچین • دووربینی لە خەڕۆیی باشترە • باوجوود پێرێ خەبەرمان زانی کە دەستەی تاژان‌و تازەبان‌و(٣) مەحموودبەگی برای ئەحمەدبەگ لەگەڵ

---

(٣) لەچاپەکەی پیرەمێرد خۆیا (تازەبان) نووسراوە ، بەڵام ، وەك كەسانێکی شارەزا ئاگاداریان کردم ، هەڵەیە ــ م •

تەنگچیی شارباژێریی ئێمە کە مەحموودی ڕۆستەم ئاغا سەرکردەیانە بۆ جلەوگیریو ئیحتیات کەلیخانیان گرتووە • باز من دڵم ناسرەوێ • بزانم تۆ دەڵێی چی ؟

**مەحموودئاغا :**

ئاغام ! هەرچەند دووربینی زۆر بەجێیە ، بەڵام جێی باوەڕ نییە کە خوسرەوخانی شەرەفولمولك بۆ عیشوەی نازدارەکۆتێك خۆی تووشی سەودایەکی وا بکا کە پەنجە لەگەڵ لەشکری ئێمەو بانەدا لێبدا • لەشکری ئێمە ، بەرگیوی ، زۆرتر ڕەنگینەیین لە ئەوەی جوامێر ئاغا • من ئەمڕۆ لە بارێ بووم لەخدمەت مەلامحەممەددا ، لەم لەشکری خۆمانە ئەدواین ، فەرمووی ڕەنگە ئەمڕۆ بێنەوە • منیش پیاوم ناردووە لە سوورکێو بوەستێ • هەرگا لە مازوانبەندەوە سەرەتای لەشکری دی زوو مژدەم بداتێ •

**سەلیم ئاغا :**

بەخوا ، مەحموودئاغا ، ئەگەر ئەمڕۆ سەرەتایان دەرنەکەوێ یا خەبەرێکی ڕاست وەرنەگرم ، ئارامم نابێ • خۆتان ئامادە کەن ، دەڕۆین •

لەووەقتەدا ئەحمەد زلێخای گزیر دێتە ژوورەوە • بە چالاکی دەچێتە بەردەمی سەلیم ئاغا ، دەڵێ : ئاغام ! مژدە بێ لەشکر بەمەرام گەڕانەوە • چاوماری پیاوی مەحموودئاغای خەزنەدار لەپێشەوە هاتەوە ، دەڵێ : لە سەری سوورکێو بووم ، دەستەی سیوەیلی کە(٤) لەشکری مەحموودئاغای کوڕتن بە گۆرالیوتن دەهاتنو ، مەحموودئاغا خۆیشیم دی سواری ئەسپە سوورکێو بووبوو حەمایڵو بەنقەرەبیناکەی لەدوورەوە بریقەی دەهات •

---

(٤) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا «لە» نووسراوە • دیارە هەڵەیە • کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا وەك منی ڕاستکردووەتەوە – م •

سەلیم ئاغا :

خۆش خەبەر بی گزیر ، بچۆرە لای عەبیلانی[٥] مارف ئاغا کورتەڵو ڕانکێکی باشت بۆ بکڕێ .

مەحموودی خەزنەدار :

رنج گل بلبل کشید و بوی گلرا باد برد

چاومار ، بەھەلەداوان ، لە سوورکێو عارەقی ڕەشومۆر دەرکاو مژدە بێنیو گزیر خەڵات وەرگرێ .

سەلیم ئاغا :

ئاغا ! خوا بەشی ئەویشی داوین .

مەحموود ئاغا :

خێر ، ئاغام ، مەبەست ئەوە نییە . ئەسڵ مزگێنی لەسەر بەندەیە . بەڵام ویستم ئەحوالی دنیات عەرزبکەم . ڕەوشتی دنیا ئەمەیە .

لەم گفتوگۆیەدا دەبن ئەحمەد حەیتە لەپێشەوەو براکانی تری لەدواوە پەیدابوون .

سەلیم ئاغا :

ھا ، حەیتە ! بەخێربێیتەوە . شوکر بەدەماغی .

ئەحمەد ئاغا :

ئاغا ! یونسی ئەحمەدبەگمان کرد بە زاواو[٦] خوشکی یونسیشمان بۆ مەحموودی برام داناوە . منیش حەیتەیم بۆ ماوە .

---

(٥) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیو ، ھەروا لە چاپەکەی کاکەی فەللاحیشا ، نووسراوە : « عبیلانی » ــ م .

(٦) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا بەمجۆرە نووسراوە : « یونسی احمد بگمان کرد ، بزاوەو ... » . من بە نیشانەی ڕستەی پاشەوەیدا بەوجۆرەم ساغکردەوە کە لەسەرەوە نووسراوە ، بەڵام کاکەی فەللاح لە چاپەکەی خۆیدا بەمجۆرەی ساغکردووەتەوە : « یونسی ئەحمەدبەگمان کرد ، برایەوەوە ... » ــ م .

سەلیم‌ئاغا پێدەکەنێ ، دەڵێ :

**سەلیم‌ئاغا :**

حەیتە ! لێرە دەنگ بڵاوە ئەحمەد حەیتە ئەمجارە زۆر ترساوەو لە قوژبنی مزگەوت خزاوە .

**مەحموودی ڕۆستەم‌ئاغا :**

ئاغا ! لەمزگەوت‌خزانی ناچاری ، چونکـو بەگـزادە فرسەتیـان نەبوو قوماری لەگەڵ بکەن . ئەویش دەیگوت : « خزمە ! ئەگەر قوماری ناکەن دەچم قورئان دەخوێنم » .

هەموو پێکەنین .

لەم وەقتەدا مەحموودئاغاو ئەحمەدئاغا خۆیان دەگرنە کەنار ، چونکـو ئەحمەدبـەگی کەندەسـوورەو[7] مەحموودبـەگ‌و محەممەدبەگی برای دێنە ژوورەوەو سەلیم‌ئاغا بەرزەیێ لەبەریان هەڵدەستێ‌و ئەحمەدبەگ ژوور خۆی دەخاو ماندوونەبوونێـکی گەرم‌و موبارەکبادیی یۆنس‌خانی کوڕی لێ دەکا .

**ئەحمەدبەگ :**

ئاغا ! خوا لە بزورگی‌و خزمایەتیت کەم‌نەکا . ئێمە کە لێرە ڕۆیین ، بەندە زۆر نائومێد بووم . دڵم‌گیرابوو ، چونکو ئێمە هەرچەنـد ئەمڕۆ بەقووەت لە وەزعیەتی قۆشەنی سنە زیاتر بووین ، بـەڵام ئەمە کارێکـی بزورگ[8] بوو بەگـژ حوکوومەتێکی دەهـەزار سالیدا دەچووین‌و ، شەرەفولمولکیش والی‌یەکـی فرە نەبـەردە .

---

(7) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا ئەم (و)ی عەتفە نی‌یە ، بەڵام کاکەی فەللاح دایناوە ــ م .

(8) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : « برزگ » . دیارە ڕاستەکەی ( بزرگ = بزورگ )ە . کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا هـەر (بزورگ)ی نووسیوە ــ م .

ئەم لەشکرەی کە چووبوون بۆ کەلیخان ڕێی لەشکری والی [9] بگرن تەدبیرێکی باش نەبوو • زیاتر والی قینی هەلسابوو • بەلام ، خوا بەرخورداری کا ، مەحموودئاغای کوڕت بەحزی‌یەوە کاغەزێکی لەتەرەف خۆیەوە بۆ شەرەفولمولك نووسیبوو ، نازانم چ سیحرێکی لێ کردبوە کار ، ڕاو تەدبیری مەحموودئاغا لە عیشوەو ئاشووبی نازدار بەتەئسیرتر بوو • کە والی یۆنسی تەسدیق کردو عەرزی دەرباری هومایوونی شەهەنشاهیی کردبوو • ئێمە چاوەڕێی جوابی دەربار بووین • ئەم یازدە ڕۆژە لەبەینی خۆف‌و ڕجادا ماینەوە ، تا دوێنێ چاپاری دەربار قەبالەی هێناو یۆنس بە لەقەبی خانی‌و بە وەزیفەی حاکمیی بانە سەرئەفراز کرا • ئەمەیشە ، چ قووەت‌و چ تەدبیر ، هەمووی لە سەرکاری ئێوەوە بوو •

بەو موناسەبەتەوە سوپاسێکی بێ‌پایان دەکەین • خوا بتانهێلێ • دووسەدو نەوەد ساڵ بانە بەدەست حاکمی کوردی ئیختیارەددینی‌یەوە بوو ، تا ئەم بەینە سنە حاکمی بێگانەی بۆ ناردبوو • وا شوکر بە هیمەتی ئێوەوە دووبارە حوکوومەتی بانە بوو بە هیی خۆمان • هەرچەند مستەفای کوڕم بە عومر گەورەتر بوو ، بەلام یۆنس کارئامەدتر بوو • مستەفا نائیب‌و ، یۆنس حاکم • ئەگەر نەوەی ئەسحابەکوژی فەسادی‌یان نەخەنە بەینەوە ، خوا یار بێ ، تا دێرزەمان ئەم‌دیوو ئەودیو یەك‌وجوود ئەبن • ئێستا ئێمە بۆ ماڵئاوایی هاتینە خدمەتت ، چونکو وەقتەکەی نازکە

(٩) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «ری» • مــن بــە «ڕێ»م ساغ‌کردەوە • کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا هەر وای ساغ‌کردووەتەوە • ئەیشکونجێ ڕاستەکەی « ڕێ لە لەشکری •• » بێ‌و ، (لە)کەی لە چاپا بەرببێ — م •

دەبێ بچینەوە بۆ سیاگوێزو ئەوناوە ، هەندێ ناخواەو حەسوودمان هەن سەرشکێنیان بکەمو ، ئەگەر لوتفو مەرحەمەت تەواو ئەفەرموون ، مەحموودئاغای کوڕتان تەشریف بێنێ ، بە ڕاو تەدبیرو ناوی مەردانەی ئەوەوە چاکتر کار دروست[10] دەبێ . ئیتر ئەمری خۆتانە .

سەلیم ئاغا :

لە خوام ئەوێ یۆنس خان لە سلێمان بەگی حاکمی بانە ناودارترو عومردرێژتر بێ . زاتەن کە خوا ئەمدیوی دایە دەست ئێمەو لەمدیو مەحموودی کوڕم بە ئیرادەی پادشای عوسمانی قائیمقامی هەموو شارباژێڕ بێو ، لەودیو یۆنس خانی کوڕیشمان[11] حاکمی بانە بێو[12] ئەمدیوەودیو یەکگرتنەوەو[13] ڕۆمو عەجەمیشمان بەدەستەوە بێ ، خوا یار بێ ، هیچ قووەتێ ناماندەرزێنێ . تۆ ئێستا مەحموود ئەبەی لەخدمەت خۆتا ، ئاخۆ خوا وادەکا پاش چەندێکیتر بۆ کارێکی خێر منیش خۆم بێمە خدمەتت .

ئەحمەدبەگ :

خوا هەموو کارێکمان بە خێر بگێڕێ .

ئەحمەدبەگ دوعاخوازی دەکاو ، مەحموودئاغایش دێتە خدمەت باوکیو مەرەخەسی دەخوازێو دەڕۆن . دوای ئەوان مەحموود هۆمەری خەزنەدار ڕوودەکاتە سەلیم ئاغا ، دەڵێ :

---

(۱۰) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا « دروستی » نووسراوە ، بەڵام ئەبێ ( دروست ) بێ . نیشانەیەکی ئەوەیش دیارە ویستراوێ لە مەکینەی چاپا (ی)کە بکرێتەوە . کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا هەر (دروستی)ی نووسیوە — م .

(۱۱) لەبوو بووترایە : « لەودیویش یۆنس خانی کوڕمان » — م .

(۱۲)و (۱۳) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا ئەم دوو (و)ە نین ، بەڵام پێویستە بن . کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا تەنها دووەمیانی داناوە . ئەبوو لەجیاتیی ( ئەمدیوەو دیو )یش ( ئەمدیوو ئەودیو ) بوایە — م .

**مەحموودئاغا :**

ئاغا ! خوا موبارەکی‌کا • واتێگەیشتم مەحموودی کوڕت دەنێری بۆ سیاگوێز ، بکەوێتە حەلقەی کەمەندی زوڵفی پەریچیهرەی کچی ئەحمەدبەگەوە • هەرچەند بۆ سیاسەتی ئەمڕۆ تێکەڵی‌و خزمایەتی لەگەڵ ئەماندا بەجێیە ، بەڵام مەحموودی کوڕی تۆ نەمامی باغی دەوڵەتی عوسمانی‌یەو قائیمقامەو بەهۆی قائیمقامەتی‌یەوەیە کە ئەم لەشکرو سوپای ئالانو شارباژێڕو بەرکێو ، ئەم بگرەوبەردەیەی بەدەستەوەیە • ئەگەر لەزەری حوکوومەتتان لەسەر نەبێ لەم بەردە ڕەقەدا دەبێ ئێوە هەر ماشی هۆمەرلیک بخۆنو ، مەگەر تەنها لە چوار دێی سیوەیلەکەدا بتالناسن • لەپێش چاومانە دوێنێ ، هێشتا نەبوە بە پێرێ !! نەڕە شێرێکی وەك عەزیزبەگی بابان کە بە حەسەب‌و نەسەب‌و شەجاعەت قیاسی لەگەڵ ئێوە ناکرێ ، خزابووە قەڵای سرۆچك بەڕوویان دەکرۆشت‌و خوێڕی‌یەکی وەك سمایل‌پاشایان ناردبوە سلێمانی حاکمی سلێمانیی دەکرد ، چونکو کەمەربەستەی دەوڵەت بوو • ئێستا بە من بێ ئەگەر بۆ قووەتی عەشائیری بێ وا وەلەدبەگیی جاف زاواتن ، مەحموود یا ژنێکی لە میرئاودەلی‌یان بۆ بێنە یا لە سلێمانی کەسێکی ئەرکانی حوکوومەت بگرنە دەست • بزانە جاف بەئەکسەریەت ژن لە سلێمانی دێنن کە حوکوومەتیان بەدەستەوەیە • ئینسان دەبێ تەنها بۆ ئەمڕۆ نەژی ، سبەی ڕۆژی ئەولادو عەشیرەت‌و کەسوکاریشی لە پێش‌چاو بێ •

**سەلیم‌ئاغا :**

ئاغا بەخوا فکرەکەت پەسەندە ، بەڵام نسیب‌و قسمەت بەدەست خوایە •

« لێرەدا پەردە دائەدرێتەوە »

« پەردە هەڵدرایەوە »

## پەردەی دووسەم

**مەحموودبەگە شەلە :**

وەختێ کە (بابەك) لە نەسلی (ساسان) لە دیاربەکرەوە هاتە شارەزوور بەناوی (بابەئەردەڵان)[14] .(بابا) موخەففەفی (بابەك) . (ئەردئاڵان) بەتورکی (پشت‌سێن) . قەدیم ، سوار پشتی لە سوار ئەسەند ، غالب بوو[15] .ئەم بابەئەردەڵانە بە ئازایی‌و سوارچاکی‌و بەخشندەیی هەموو عەشائیری هێنایە ژێر حوکمی خۆی . عەشائیری ئەووەختەی شارەزوور ، زۆرتریان لەك‌و لوڕ بوون . لە نەوەی (گیوی گۆدەرز)ن‌و (گۆران)یشیان پێ‌ئەڵێن . ئەنجا کە بابائەردەڵان ئیعلانی حوکمداریەتیی کرد ، ناوی خۆی نا (قوبادی فەیرووزی ساسانی)[16] . حوکوومەتی کوردستانی(★) دامەزراند ، تاقمێ لە گەورانی ناردە (بانە) کردنی بە

---

(١٤) ئەم ڕستەیە ناتەواوە ، مەگەر بڵێین ڕستەی پاشەوەی تا ئەگاتە ( ئەم بابەئەردەڵانە ) جوملەی موعتەریزەیەو ، ڕستەی ( ئەم بابەئەردەڵانە .. تاد ) بینەی ناتەواوی‌یەکە ئەکا ـ م .

(١٥) ئەبوو «ئەبوو» بووایە ـ م .

(١٦) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆی‌و ، هەروا لە چاپەکەی کاکەی فەللاحیشدا ، کەوانەکە پاش وشەی (فەیرووزی) داخراوەو ، خاڵەکەی پاش (ساسانی)یش نی‌یە . من بە بۆچوونی خۆم لاموابوو وا هەڵەیەو بەمجۆرەم ڕاست کردەوە کە لەتێکستەکەدا نووسراوە ـ م .

(*) ئەمە شایانی وتنە کەوا لە چاپەکەی کاکەی فەللاحا پێش وشەی (کوردستانی) وشەی (حوکوومەتی) لادراوە . لاموایە ئەوە کاری ئەو برا بسپۆرە بووە کە دەزگای سانسۆر دەسنووسەکەی کاکەی فەللاحی داوەتە دەست لەڕووی سیاسەتی ڕاگەیێنی‌یەوە هەڵیسەنگێنێ ! ـ م .

حاکم • لەوانە دوانی ئەردەلأن • (میرزابەگ)یٔ لە حاکمانی بانە هەلـکـەوت[17] زۆر ئازاو نامـدار بـوو • (بێگەبـەگ)ی حاکمی ئەردەلأن کچی خۆی دایەو ، لە نەوەی ئـەوان ( سلێمان‌بـەگ ) هەلکەوت بە ویلایەتی شیوەکەل •

لەوێدا مەحموودی ڕۆستەم‌ئاغای شیوەکەل ئەلێ :

**مەحموودئاغا :**

میرم ، ئەمە نوکتەیە • ئێمەش ئەبێ خدمەتیـان بکەیـن‌و کچیـان بدەین‌و کچتان بدەنێ •

**مەحموودبەگە شەلە :**

خێر ، ئاغام ، شەرت ئەمە نی‌یە هەر ئێوە کچ‌بدەن بە ئێمە • ئێمە قەرزدارین کچ بدەین بە ئێوە • فەرموون ، تێکەون ، هەلبژێرن •

لە عەینی پەردەدا ، لە سیاگوێز ، مەحموودئاغـا نووسـتـووە • پەریچیهرە ئەچێ جاجم بدا بەسەر جێگاکەیا •

**مەحموودئاغا :**

ئەوە کێیـە ؟

**پەریچیهرە :**

پەریی کارەکەرتە •

**مەحموودئاغا :**

ئەللاهـ ! پەری بە شەو بێتە خەوی ئینسان ! وەرە شێت مەبە •

---

(١٧) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆی‌و ، هەروا لە چاپەکەی کاکەی فەللاحیشا ، نووسراوە : « هەلکەوت‌و » • بەلأم ئەو (و)ە زیادەیەو پێویست نی‌یە • لەبەرئەوە من لێرەدا لام‌برد ــ م •

پەری :

ئەزانم تۆ لە جنۆکەو مۆتەکەو مەڕنەمووکە ناترسی ، چ جای من هاتووم داتپۆشم سەرمات نەبێ .

مەحموودئاغا :

کەسێ گڕی لە دەروونندا بێ چۆن سەرمای ئەبێ ؟!

پەری :

پەنابەخوا ! بزانین ئەم گڕە کێ ئەسووتێنێ ؟

مەحموودئاغا :

تەنها خۆمو دلم .

پەری :

جاجمەکەی پیائەداو ئەلێ : ئای چیم بە خۆم کرد ، یا دل چیی پێ کردم ! نەدیوو نەناسیو لەخدمەت ئەم کوڕەدا ڕازم داداوە[18] نایزانم کە هێشتا دەورەی پەردەپۆشیو کەمناویی کچانە .

ڕادەکا بێتە دەرەوە .

مەحموودئاغا :

بانگی ئەکا : توخوا ڕاوەستە ، مەعنای ئەم دوو کەلیمەیەم پێبلێ : پەردەپۆشیی کچان مەعنای چییە ؟

پەریچیهرە :

موساعەدە بفەرموو . درەنگە بەبەریەوە نەماوە ڕاوەستم ، چونکو بە عادەتی ئەم ئەهلە نەوەك گفتوگۆکردن لەگەل کوڕاندا ، بەلکو هاتنە ئێرەیش نارەوایەو نابەجایە .

---

(١٨) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا «داوە» نووسراوە . دیارە هەلەیەو ڕاستەکەی بەوجۆرەیە لەسەرەوە نووسراوە . کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا هەر وای ڕاستکردووەتەوە ــ م .

بەڵێ ، وادەزانن هەرچی بەشی ئافرەت هەیە خوا هەر بۆ ئەمەی خەڵق کردوون ئەسبابی لەیفەو هەواو هەوەسی نوڕان بن‌و ، تێرینەیش کە ئافرەتی دی بە حەڵوای نەرمەقوونی بزانێت • ئیتر ئەمنیەتی[١٩] ناموس لی‌یە • ئاخ ! ئەموریست خوا یا بە ئافرەتی خەلق نەکردامایە یا نەمخوێندایە وە لـە بـەر خەرەلدا دانیشتمایە بێ‌حیس‌و بێ‌شوعوور دەماغم بە حیکایەتی دێوو پەری‌و چەرخوفەلەکی پیرێژنەکان پەروەردە ببوایە ، ئەوسا نەمئەوت[٢٠] ژنانیش حەقی حەیات‌و مەوجوودی‌یەتیان هەیەو بە شیربایی نافرۆشرێن‌و ، بۆ تەشکیلی عائیلەو دلسۆزی بۆ مێردو ئەولاد لە پیاوان پێشترن‌و[٢١] ، لە حەیاتی عائیلەدا ڕوکنی موهیمن • ئاوا بگە لە کەلیمەی پەردەپۆشی‌و ، بەستەزوبانی ئەمە بوو[٢٢] •

---

(١٩) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا وا نووسراوە • بەڵام من لام دوور لی‌یە هەڵە بێ‌و ڕاستەکەی (ئەمنیەتی) بێ • ئەگەر (ئەمنیەتی) بێ ، ئەبێ وا مەعنای لێ بدرێتەوە : لە غەیری ئەم سوورەتەدا مرۆ لە ناموسی خۆی ئەمین نابێ — م •

(٢٠) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا «نەم‌ووت» نووسراوە ، بەڵام شوێنی (ا)ی لەنێوان (م)ەکەو (و)ی یەکەما بە چۆڵی ماوەتەوە • دیارە تیپی (ا)ەکەیەو لەکاتی چاپا پەڕیوە . کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا هەر وەك منی ڕاستکردووەتەوە — م •

(٢١) ئەم ڕستە لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا وا نووسراوە : «تشکیلی عائلەو دلسوز میردو اولاد لەپیاوان بتشترن‌و» . من ئەوەم بە هەڵەی چاپ‌و شێوەنووسین زانی‌و وام ساغ‌کردەوە کە لەسەرەوە نووسراوە • کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا تەنها وشەی (دلسوز)ەکەی کردووە بە (دلسۆزی) — م •

(٢٢) وادیارە پیرەمێرد کە لێرەدا بە زمانی پەرێچیەرەوە مەبەستی لە (پەردەپۆشی) لێکدایەوە ، لای‌وابووبێ پێشان لەجیاتیی (کەم‌ناوی) — یا (کوم‌ناوی) ، ئەگەر ڕاستەکەی (کوم‌ناوی) بێ ، — نووسیویە : «بەستەزوبانی» ، بۆیە ئەڵێ : «بەستەزوبانی ئەمەبوو» — م .

هەرچەند وەختی ئەم قسەیە نەهاتووە ، بەلاّم وای ئەبینم کە دایك‌و باوك ئارەزووی خواهیشتێکی پەنهانیان دەربارەی من‌و تۆ هەیە ٠

خۆ منیش ساحێبی عیززەتی نەفس‌و ڕەئیی خۆمم ، فرۆشتەنی نیم٠

**مەحموودئاغا :**

سوبحانەڵلا ! ئەووەڵ من وتم پەری شەو بێتە خەوی ئینسان ، شێت ئەبێ ٠ ئەوە مەقسەدم تەئسیری حوسن‌و جەماڵ بوو ٠ ئێستا ئەم گفتوگۆ بەشوعووروو کەمالە[٢٣] پەری‌یە یا پەری !! پەری ٠٠ پەری ٠٠ مەڕۆ ، دانیشە ٠ درەنگ ئەبێ ، نایێت ، مەجیووڕت‌کردم دوو کەلیمەی دەروونی خۆم بەیان بکەم ٠ ئەووەڵەن من موتەحەییرم تۆ لەم بەردە ڕەقەو لەم نەسلە کەلەشەقە ئەم دەماغەت لەکوێ بوو !! دووەم با تێت‌بگەیەنم من کوڕی سەلیم شیوەکەلیم ٠ باوکم لەناو دارو بەردا گەورە بووە ٠ پیشەمان شەڕوشۆڕو تەعەدداو کوشتن‌و بڕینە ٠ مادام دەربارەی پیاوان ئەمە بێ[٢٤] ، ئەشێ چۆن تەماشای ژنان بکەین ؟ دایکم تەنها حەقی سەرپەرشتی‌و تفاقی ماڵ‌و نان‌و چێشتی خۆمانی هەیە ٠ هەموو کارەکەر ، هەموو لەژێر چەپۆك‌و توانجی ئەودان ٠ ئەبێ ئەوان بۆ من ژن‌بێنن ، چ‌دەستەڵاتێکی هەبێت[٢٥] ؟ بەلاّم ، خێر ،

---

(٢٣) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : « ئەم گفتگۆیە شعورو کمالە » ٠ ئاشکرایە ئەوە هەڵەیەو ڕاستەکەی بەوجۆرەیە لەسەرەوە نووسراوە ــ م ٠

(٢٤) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «بیت»و ، کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا «بێت»ی نووسیوە ٠ من ئەوەم بەلاوە هەڵەیەو ڕاستەکەی (بین)ە وەك لێرەدا نووسیومە ــ م ٠

(٢٥) ئەم ڕستەیەم بە ناتەواو دێتە پێش‌چاو ، چونکە لاموایە مەبەست لێی ئەوەیە : ئەگەر ئەوان ژن بۆ من بێنن ، ئەبێ ئەو ژنە چ‌دەستەڵاتێکی هەبێ ؟ ــ م ٠

هەزار بار خێر • خوێندەواریو ڕۆمانی تورکیو کتێبی ئەحمەد مەدحەت ، ئادابی موعاشەرەتی ئورووپا ، هەمدەمو هەمفکری سالمو کوردی کە زۆرم خۆش ئەویستنو هەمیشە لە خزمەتیانا بووم ، وایان چەسپاندۆتە کەللەمەوە کە ئافرەت ئەبێ نیوەی[٢٦] حەیاتی پیاو بێ ، هامدەمو دلسۆز ، هەمسەوداو بەسۆز بێت • غایەی هەردوولا تەشکیلی عائیلە بێت • مەرام لە تەشکیلی عائیلە ئەوەی چاك پێگەیاندنە کە خزمەتی خاكو عەشیرەتو قەومو قبیلە بکەن وە نەهێلن ولاتیان پامالی بێگانە بێتو ، میللەتی داماوی دەستی دوشمن نەبن • ئائێستا کە بە ڕەبەنی ماومەوە ، لەم خاکەدا کەسێکم شك نەبردووە لایقی عیشقو تەشکیلی عائیلەو هەمدەمو هەمدل بێت • ئێستا جارێك بزانم ئەم بلندەماخیەت لەچیەوەیە ، بە چ فکرێكو قووەتێك خۆت لە ژنانی ئەم ولاتە جوێ ئەکەیتەوە ؟

پەریچیهرە :

بەلێ هەروەکوو دوو ڕەمزو ئیشارەتی من ، تۆی خستە هەیەجانەوە ، وەك شەرابت خواردبێ هەرچی لە دلتا بوو دەرتبڕیو ، عەجائیبت لە من ما چۆن لەم بەردە ڕەقەدا ئەم لێکدانەوەیەم هەیە ، منیش سەرم لە تۆ سڕ ماوە ئەم زەبروزەنگە لەعاقاری پیاو[٢٧] ، ئەم نەرمونیانیە لەڕاستی ژنان[٢٨] لەکوێوە

---

(٢٦) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «نیوە» • من لەو (ی)یەم بەلاوە پێویست بوو کە خستوومەتە سەری ــ م •

(٢٧) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «پیاوە» • من ئەوەم بە هەلە زانی ، یا ئەبێ ڕاستەکەی (پیاو) یا (پیاوە) بێ ــ م •

(٢٨) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «ژنانە» • دیارە ئەم (و)ە هەلەیە • کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا لای بردووە ــ م •

پەیدابووە ؟ جاریّ تۆ سیوەیلی کەلیت کە سیوەیلی کەللەیان لە گوێزیان سەختترەو ، مەحموودی سەلیم شیوەکەلیت کە لە هەموو براکانی جەنگاوەرترە ، چۆن ئەم فەلسەفەی حەیاتەت[29] بۆ حەل بووە ؟ من لە تۆ موتەحەیرم‌و تۆ لە من سەراسیمە . کەواتە با باوەڕ بە یەك بکەین . کتێبی تورکیش ئەخوێنمەوە . هێجگاری لە ڕەوشتی ئێرەم لاداوەو ، ئەمەم گرتووەتە پێش‌چاو کە ڕۆژێ سەرم پان‌ئەکەنەوە . باز پێم‌خۆشە ، قوبوولی عیززەتی نەفس شکاندن ناکەم .

مەحموودئاغا :

ئەگەر ئێمە هەردوکمان لەم ئەخلاق‌و تەبیعەتەدا بین ، هیچ نەبێ خۆمان لە ژیانی هامسەری‌و هامفکری لەززەت ئەبەین‌و ، بە مەحەبەتی ئەخلاقی‌یەوە خۆش ڕادەبوێرین . ئەمە یەك .

دووهەم هەر مەحسوولێکی حەیاتمان بێ ، ئەوایش لەسەر سروشتی ئێمە بڕۆن ، سەعادەت‌و بەختیاری بۆخۆیان تەئمین دەکەن‌و ، لەڕێدا هەیە کەلکی میللەت‌و وەتەنی خۆیان بگرن . لە زەمانی سەعادەتەوە تا ئەم قەرنی ئەخیرە ڕابیتەیێك کە هەموو میللەتێکی یەکدەخست دین بوو . چەندێك دینیان کرد بە ئالەتی شەڕوشۆڕ ، هەر حوکمدارێ ئارەزووی بیوایە بچوایە بەگژ حوکوومەتێکی‌تردا ئیعلانی جیهادی ئەکرد . موسولمان موسولمانی بکوشتایە جیهاد بوو . ئێران‌و تورك کە هەردوکیان خودایێك‌و پێغەمبەرێکیان دەپەرست ، بە ناوی جیهادی دین یا ئیختیلافی

(۲۹) لە چاپەکەی پیرمێرد خۆیا نووسراوە : «خیانت» . ئاشکرایە هەڵەی چاپە . کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا هەروەك منی ڕاستکردووەتەوە ـ م .

مەزهەبەوە ، یەکتریان دەکوشت ، خێر بوو . ئێستا خەڵك لـەم
فروفێلە گەیشت . ئیتر نە ئەهلی سەلیب بۆ دین یەکدەگرن ، نە
ئیعلانی جیهادی خەلیفە[۳۰] . تەنها ماوەتە سەر ئەوە ئەو خاکەی کە
باوكو باپیری تیا هەڵکەوتووەو پراوەتەوەو نیشتمانەو خۆتی تیا
دەژیت ، نیگەهداریی ئەو خاکە کە وەتەنی پێ دەڵێن . ئەوە پێش
هەموو مەرامێك دەکەوێ ، چونکو ئەگەر تۆ نیشتمان نەپارێزی ،
قەومو عەشرەتو کەسوکارت دەربەدەر ئەبنو بێکەس دەمێنیتەوە .
پیاو کە بێکەس بوو ، لە هەمووڵایێکەوە تێیهەڵئەدەنو ، فەرزەن
تێشیان هەڵنـەداو دەوڵەمەندیش بـوو ، بەپێـی ئارەزووی
بەشەریەتو حیسـی ئیجتیماعیی ئینسانیەت پیاوی تەنها غەریبەو ،
غەریبیش لەززەت لە دنیا نابینێ !! وا خۆشە پیاو پارووە نانێکـی
بێ لەناو کەسوکارو قەوموقیلەدا بیخوا . مادام زیندەگانی گرو
پێکە ، ئەوی بۆت دەمێنێتەوە هەڵکردی یەکدڵـیو دڵسـۆزیو
خۆشگوزەرانیی ناو قەومو نیشتمانە . ئەگەر تۆ میللەتی خۆتـت
خۆشبوێ ، ئەوانیش تۆیان خۆشدەوێ . سەعادەت لە سەعادەتی
زیندەگانیی خۆشەویستیدایە . عیشـقو سـەودای جەماڵێـك
فەردییە . ئێستا بڵێین[۳۱] هەردوکمان یا بۆ جەماڵ یا بۆ کەمـاڵ
یەکتریمان خۆشدەوێ ، هەرچی بڵێیت[۳۲] ئەمە خوسووسیـیە ،
لەززەتی خۆشەویستییەکی عوموومیی تیا نییە . هەرگاه عوموم

(۳۰) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : « خەلیفەی » . من ئەوەم بەلاوە هەڵەی چاپ بوو ــ م .

(۳۱) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «بلـین» . دیـارە مەبەسـت «بڵێـین»ە .

(۳۲) لـە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیـا نووسراوە : « بلیت » . دیارە مەبەست «بڵێیـت»ە .

خۆشیویستی ، ئەوسایە لەززەت لە خۆشەویستیی خوسووسی
دەبینێ ، چونکو ئەگەر قەومو قیلەت خۆشیان نەوێت ، با منیش
زۆرم خۆش بوێت ، باز ئەو لەززەتەی نی یە • وەقتێ لەززەتی
خۆش گوزەرانی دەبێ ، میللەتت دەولەمەند بن ، زەلیل نەبن •
هەرچەند چاوت بە زەلیلیو داماویی ئەوان بکەوێ ، تۆ هەرچی
بیت ، دلت دەگیرێو عەیشت تاڵ ئەبێ • بەڵام کە عەشرەتت
لەپێشەوە بوو و وەتەنت ئاوا بوو ، لە هەر گۆشەیێکەوە شاییو
سەیرانێک دەبێو ، لە هەر کەسێکیدا گوزەرانێ دەبێ ، ئەوسا
بە دڵ خۆشی یەوە دلداری خۆشە •

ئاخ ! خوا ڕۆژێك بڕەخسێنێ کە هەر شارێک خوێندەواریی
تێ بکەوێ • هەموو بزانن کە خۆشیو قەدری ئینسان بەحورمەتی
قەومو ئاوەدانیی نیشتمانیەوەیە ، ئەگینە ئێستا من بڵێم :
وەتەنپەروەرم ، درۆدەکەم • هەموو بۆ دەبدەبەو ناوو شوهرەتی
خۆم بەگژ عەشرەتەکانیتردا دەچم • لەبەرئەوە گەورەی
عەشیرەتەکانیتر دیارە نایانەوێ من بیم • هەرکەسە بووەتە دزی
گای خۆیو هەریەکە بووەتە ملۆزمی فەقیرو هەژاری قەتمەیێك •
هیچ کەس نابینم جوزئی مەنفەعەتێکی خۆی بۆ مەنفەعەتێکی زۆریێ
عومومی فیدا بکاو ، تا هەرکەسە بۆخۆی بێ بە هیچ نابێ ، با
ئەمڕۆیش بڵێن پارەدارە خۆشیان ئەوێ • سبەینێ کە خوێندەواریێ
چاوو گوێی میللەتی کردەوەو زانییان هەر بۆ خۆیەتی ، ئەو
قەدرەی نامێنێ • هێجگار یەکێ لە دەردی نەخوێندەواری ئەمەیە
کەسێکی زۆردار هەڵدەسێ بەشی کەسبوکاری مسکێن ئەبا بۆ
خۆی یا ڕەنجی ساڵێکی زمراعەتەکەی بە شەش گەز چیتو دە کەللە
شەکر لە دەست وەردەگرێو دەولەمەند ئەبێ • بە مەعزی ئەمە کە

پارەی هەیە تاقمێ پێکارو پێکارەی هەمیشە لەدەور کۆدەبنەوە ، وادەزانن پارەیان بۆ هەلدەڕژێنێ ، کەچی پێش مردن کفنیان بـۆ ئەکـا .

خۆلاسەی کەلام ، ئێستا مـن کـە مەوقیعێکـی بلندی عەشیرەتیو حوکوومەتیم هەیە ، پێم‌ناکرێ هەولی ئیسلاحی ئەم قـەومە بدەمو ، ئەگەر ڕاستیشت دەوێ بـە ئیشم دەسـتـنـادا . چونکە ئەم خەلکە ئەگەر تێگەیشتوو بن ، بۆ من دەست نادەنـە تفەنگو بۆم بچن بەگژ لەشکری دوشمنی منداو ، ئەم خاکـی ئێمەیش خوا ئاوەکەی وا بۆ ڕشتووە هەموو عەشائیر دوشمنـی یەکینو لە حودوودیشداین ، لەبەرئەوە بۆمان ناکرێ ئەم ئەهالیە سەوقی سەر خوێندەواری بکەینو لە دەست خۆمالی بکەینەوە . ئەمە مەسلەکی ناچاریە ، یەعنی من بمەوێو نەمەوێ دەبێ هەمیشە سێسەد چوارسەد تفەنگم ئامادە بێ ، ئەگەرچی ئەمە حەیاتێکـی وەحشەتە . جا ئەگەر خوا بەزەویی بە مندا بـێو ڕەفیقەیێکـی دلسۆزم بداتێ ، هیچ لەبێ بە شەو کە فەراغەتێکمان بوو دەردی دل لای یەك هەلەڕێژینو[٣٣] تەسەللایێکمان بە یەکتری ئەبێو ، ئەگەر خوایش بیدا ، ئەولادمان بێ ، بەپێی دلو دەروونی خۆمان بیهێنینە بەرهەم .

پەریخـان :

ئێستا وا تۆ لە ئەووەل مولاقاتدا منت بە هەمسەری خۆت زانی ، هەموو داخی دلت لای مـن هەلڕشـت ، بەچـی مەعلووم کـە

(٣٣) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : وەهەلریژینەوە . ئەمە هەلەیە چونکە لەگەل (ئەبێ)کەی پاشەوەی ڕێك‌ناکەوێ . بۆیە یا ئەبێ وابێ کە من لەسەرەوە نووسیومە ، یا (هەلڕێژین) بێ بێ (و)ەکە — م .

مـن ئەو قابلیتـەم هەیـەو ، ئەوەتـی بنیادی ئـەم خاکە دانراوە ، لەم ولاتـەدا نەبوە بـە عادەت کەسێ شارەزای کەسێ نەبێ[٣٤] ، لەخۆیەوە داواکـاری بێ • خوازێنـی بە دایك‌و باوکـە • ئێمـە ئورووپایی نین بلێین وا لە حوزووری ویجداندا تۆم قوبـوول کرد • لێرە ویجدان میچدانە کە منداڵان میچی یاری پێدەخەن • جارێ لازمە تۆ شیفتەی شیرینی زولـفـو خاڵ نەبـی • ڕەنگـە من هەندێ خووم هەیە کەڵکی حەیاتی عائیلەویی تۆ نەگرێ • جارێ سەرم ئەمەندە هەوای عیزەتی نەفسی تیایە توانای چەپۆکی خەسووی نی‌یـە • دووەم بە تەجـرەبـە دەرکـەوتووە کچێکـی خوێندەوار کە کەوتووەتە ناو دەستەی ژنانی لادێـوە ، هـەزاران بەندوباوی لێ کراوە : ئەیەرۆ بە مێردەکەی خۆی ئەڵێ مەحموود ، هیچ شەرم‌و حەیا ناکا بە شـەو بەرامبـەری دادەنیشێ ، هـەزدە هەزدە قسە ئەکاو ، کە لە دەردا مێردی دێتـەوە جـارێ لەپێـش هەموو چشتێکدا دەستی دەگووشێ ، لەسەر کورسی لنگ دەنێتە سەر لنگ • ڕاسە ئاخر زەمانە • هێچکار لە هەموو شوورەیی‌تـر لەگەڵ مێردیا دادەنیشێ چا دەخواتەوە • ئێمە سەرمان سپی بـوو هێشتا کەس نەیدی لای مێـرد ئـاو بخواتـەوەو هێشتـا نـاوی مێردمان بە زماندا نایێ • لەپێشدا هەر پێی‌دەڵێـن : ئـەو • کـە منداڵیشمان بوو ئەنجا دەڵێن : باوکی فلان • خۆ من ئـارەزووم هەیە فێری عوود لێدان بم‌و دەنگیشم خۆشە • ئەگـەر لە مێـردم پشت‌ئەسـتوور بم عوودیش لێئـەدەم‌و گۆرانی‌یش ئـەڵێم • نیهایەت پێم‌ئەڵێن (سۆزانی) • خۆ هیچ نەبێ ئاسارێکی سەنایی

---

(٣٤) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «کەس شارەزای کەس لەبـێ» بێ (ی)ی پاش هەردوو وشەی (کەس)ەکە • من ئەوەم بە هەڵەی چاپ یا شێوەنووسین زانی •

تەفیسەو جەسارەتێکی مەدەنیە دەخەمە ناو جینسی لەتیفەوە • ئەو لەونە ، یەعنی ئەم حورڕییەتە بەکەلکی کەس ناشێ • کەواتە ئەگەر هەر بە کچێنی لە مالی باوکدا بمێنمەوە ئەم حیسیاتە ئەخەمە بن گوێزی سیاگوێزەوە دەینێژم ، بەلام تا پێم بکرێ کچانی کۆدەکەمەوە ، بە ڕۆژ جزمیان بۆ دەنووسمەوە ، فێری خوێندنیان دەکەم ، ئەوسا بە خوێندەواران سوپای خۆم وا ڕێك دەخەم کە ڕۆژێك بێ لەشکری نادانی بشکێنن •

ئیتر ئەمە منو کردەوەو فکرو نییەتم • تا دوو ڕۆژی تر مۆلەتت بێ • ئەگەر بە ئیشت دەستئەدا ، کاغەزێ بنووسە بۆ باوکت بێتە ئێرە ، با لە ڕاهوڕەسمی ئەوان دەرنەچین ، خوازبێنی بکا • بەلام ژنان هەردوو لامان مالوێران نەکەن : دە دەست قەنەوزو شەش دەست مەخمەلو چێتوکەو پێتوکە لەوناوەدا لەتوپەت بکەنو ، هەردوولا پارە بخەینە گۆمەوە • من کە بووم بە کەبانووی مالی خۆم ، خۆم جل بۆ خۆم دەکەمو ئەو پارەیە ئەدەم بە ئەهالیی فەقیر کە لە ژێر باری سەلەم بێتەدەرێ • خوا ئەگەر تا دوو سبەی هیچت نەنووسی ، منیش بە نەزەری میواتێکی عەزیزت دەلوارمێو تا لێرەی پێلاوت لەسەر چاوم ، کە ڕۆیشتی بەخێر چی • ئەمە دوایی قسەمەو ، ئەوا ڕۆیم • ئیتر ناگەڕێمەوە •

لەپاش ئەوە پەریچیهرە ڕۆیی ، مەحموود ڕاستئەبێتەوەو لە ئۆتەکەدا دەستئەکا بە پیاسەو لەبەرخۆیەوە دەلێ :

سوبحانەللا ! خودای گەورە ، هەرتۆ ئەتوانی لەم کوێرەدێی ئەم حودوودەدا دەماغی کچێکی جیهاننەدیدەو لە ئەسەیێکی وەحشی بەمنەوعە ئەفکارو فەلسەفەیە بڕازێنیتەوە کە هیچ کچە

وەزیرێك ناتوانێ ئەم حیسیباتەی بێ • ئێستا من لەوە سەراسیمە ماوم ئەو ژن بێ‌و من مێرد ، چۆن ڕووم بێ پێی‌بلێم : ژنەکە ، لەگەڵ ئەوەیشدا دەڵێن :«دشمن دانا بە از نادان دوست» • تەوەککول بە خوا • توخوا زۆرم حەیاتی شەقاوەت‌و وەحشەت دی ، با چەندێکیش سەعادەتی عائیلەو بەختیاریی موصاحەبەی ژنی دانا ببینم • هەر ئێستا کاغەز دەنووسم ، دەچم بۆ دیواخان ، قەلەم‌و کاغەزی لێیە • ئەویش لە سەحنە دەچێتە دەرەوە ، لە دیواخان قەڵەم‌و دوێت پەیدا ئەکاو کاغەزێك ئەنووسێ • ئەچێ لەدەرەوە دارای پیاوێ خەبەر ئەکاتەوە ، پێی‌ئەڵێ : دارا ، بەیانی کە شەبەقی‌دا ، هەڵسە ، کەس نەزانێ ، بە تەنها سوارە بچۆرە شیوەکەڵ ، لەپێش ئەوەدا ئاغا بێتە دیواخان ، لە مالەوە ئەم کاغەزەی بشمرێ •

## پەردەی سێیەم

لە سیاگوێز ئەحمەدبەگو مەحموودی ڕۆستەمئاغا دانیشتوو نازە هەتاو کەوتووە • کتووپڕ سەلیمئاغا ئەکا بەژوور ئەحمەدبەگ لەبەری هەڵدەستێ ، بەحیرەتێکەوە ئەڵێ : ئاغا ، خێر بێ ، وا ناگەهانی تەشریفت هات •

سەلیمئاغا :

میرم ! ئێمە سیوەیلین ، فڕوفێڵان نازانین • ڕاستو ڕ ئەدوێن • جەنابتان پەریتان لە ماڵدایە • دەستی لە مەحمو کوڕم وەشاندووە ، شێتی کردووە • هاتووم پەری بک شووشەوە بیبەم ، بەڵکو کوڕەکەم چاکبێتەوە •

ئەحمەدبەگ :

میرم ! ئەگەر پەریچیمرە پەریی کێوی قافیش بێو نە شاباڵشایش بێ ، شاباشی بەرێی مەحموودە • وا بە کراسی خۆیەوە دەینێرم • زائەن خۆی وتوویە کاتێ بمدەن بە شوو ، جلوبەرگ ناکەم • بە کراسی بەری خۆمەوە دەچمە ماڵی مێ لەوێ خۆم جل بۆ خۆم ددکەم •

سەلیمئاغا :

میرم ! من ئەم فکرەی پەریچیمرەم زۆر لەلا باشە • ئەگەر بکا ئەم جەسارەتە بنوێنێو ئەم بیدعەتە سەیئەیە لەناو

---

(٣٥) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «لەناو» • ئەوە هەڵەیە • ئەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا هەروەك منی ڕاست کردووەتەوە ــ م

هەڵگرێ ، ئاسارێکی تەئریخییە ، چونکو ئەبینین باوکێک و کوڕێک هەردوکیان ساڵەها ڕەنج ئەدەن ، شەش حەوت لیرە کۆدەکەنەوە ، دەیانەوێ ژنێک بۆ کوڕ بێنن . ئەبێ لەپێشدا ئەو پارەیە بدەن بە قەنەوزو خارای کە لە وڵاتی بێگانەوە دێت ، بیکەن بە جلی بووک کە تەنها سێ شەو لەبەردەکرێ . ئەنجا کە پارەکەیان لە جلدا خەرج کرا ، بۆ نانی شایی دەبێ سەڵەم بکەن . سەڵەمیش وەک ڕەگی گوڵ یا خۆرە وایە ، ئیتر لە کۆڵیان ناکەوێ .

...وودی ڕۆستەم ئاغا :

ڕووئەکاتە سەلیم ئاغا ، ئەڵێ : ئۆف .. ئۆف .. هەر ئەمەمان مابوو کچێک هەڵسێ بڵێ من عادەتی باوباپیرتان ئەگۆڕم ، شاییتان لێ حەرام ئەکەم ، جلەبووک و خەڵەبەندان و پڵاوی شایی و جیازی و ڕەشبەڵەک ناهێڵم . نەخوازەڵا چوار مسکێنمان بەدەستەوەیە[36] بەسەڵەم پارەیان ئەدەینێ چوار باتمان توتونمان بۆ بکەن ، ئەویشمان لەدەست بکاتەوە ، ئیتر بمانکاتە گاگەل بلەوەڕێن[37] .

...لیم ئاغا :

جواب ناداتەوە . ڕووئەکاتە ئەحمەد بەگ ، ئەڵێ : لە

---

لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «بەدەستەوە» . دیارە ئەوە هەڵەی چاپەو ڕاستەکەی بەوجۆرەیە کە لەسەرەوە نووسراوە . کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا هەر وای ڕاست کردووەتەوە ـ م .

هەرچەند ئەم ڕستەیە مەعنایەکی تەواو ئەبەخشێ ، من وای بۆ ئەچم لە کاتی لەچاپدانا هەڵەیەکی تێکەوتووە ، لەوانەیە مەحموودی ڕۆستەم ئاغا وتبێتی : کە مسکێنەکانمان ئەمان ، ئەگەر ببین بە گاوان و بکەوینە ئەو گاگەل بۆ لەوەڕاندنیان ، نەک خۆیان لەگەڵ گاگەلا بلەوەڕێن . کەواتە دوور نییە ڕاستەکەی بەمجۆرە بووبێ : «ئیتر بمانکاتە ئەو گاگەل بیلەوەڕێنین» ـ م

شوکرانەی ئەوەدا کە کوڕو کچی‌وامان هەیە ، با ئێمە بەم پیر
شایی‌و هەلپەڕکێ بکەین‌و ، مەلایش مارە ببڕێ • دوا
پەریچیهرەو مەحموود بە جووتەسوارە هەلسن بچنە مالی خۆ
لەوێ چی بە چاك ئەزانن بیکەن • بەلام مەولوود نابێ تەرك بکر
با نانی شایی لەبێ ، مەولوود بێ •

لەوێدا ڕۆینێ‌و هەلپەڕکێیەکی جوان ئەکرێ •

« پەردە دادرایەوە »

## پەردەی چوارەم

« پـەردە هەڵـدرایەوە »

موتەسەڕڕیف عەزیزپاشا دانیشتووەو ، هەیئـەتی ئیـدارەو شێخ‌سەلامی قازیو مەلائەحمەدی چاوماری مفتیی کۆکردووەتەوە.

**موتەسـەڕڕیـف :**

هەیئەتی موحتەرەمە ! ئێمە لە حودوودا قائیمەقامێکمـان هەیـە مەحموودی سەلیم‌ئاغا . ئەم زاتە هەرچەند بـە خواهیش‌و ڕەزای دەوڵەتی نەبوە بە قائیمەقامو ، بـە زۆرو جەسـارەتو قووەتـی عەشرەتی خۆی حوکوومەتی شارباژێری گرتووەتە چنگ خۆیو ، ئەستەموولیـش بەئیجابـی سیاسـەتێکـی زەعیـف لـە هەمـوو حودوودێکدا ئەم نەوعە زۆردارانە ئیستیخدام دەکـاو تەسدیقـی قائیمەقامیی ئەوی کردووەو بە ئیرادە تەعیین کراوە ، ئێستا نەك تەنها شارباژێر ، پەلی هاویشتۆتە ئۆلکەی ئێرانەوە[٣٨] . حاکمی بانەیان[٣٩] دەرکردووەو یۆنس‌خانی خزمـی خـۆی کردووە بـە حاکمو ، بەوەیـش دانامـەزرێ ، لە سەقزیشـدا هەرچـی ئـەو یۆنس‌خان نەیانەوێ ناکرێ . دەوڵەتی ئێرانیش لەم‌بابەتەوە شکاتی کردووەو ئێستا ئێمەیان مەجبوور کـردووە کە ئـەو زاتە لـەوێ لەهێلین . ئێوە ئەڵێن چی ؟

---

(٣٨) لەبوو «لێرانیشەوە» بووایە ــ م .

(٣٩) لەبوو «بانەی» بووایە ــ م .

ئەعزای پێنـــاو :

پاشـــام ! ئێمـــە ساڵهـــای ســـاڵ بەدەســـت زوڵـــمو تەعـــەددای دەرەبەگیەتیی بابانەوە هیلاك بووین تا خـــوا ئەوانـــی لەســـەر هەڵگرتین • لە تەئریخـــی ١٢٦٦ی هیجرییـــەوە کـــە ئـــەووەڵ موتەسەرریفی دەوڵەت ئیسماعیل پاشا هاتووە توانیومانە بڵێین[٤٠] زیندەوەرین • ئێستا ئەم مەحموودئاغایە لـــە بابان زاڵمترە ، دارو فەلاقەی هەیە • لە هیچ دەوڵەتێ ناپرسێ • تەبەعەی هەر دەوڵەتێ لەوێدا بێ خەرجی لێ دەستێنێ • بێ پرسی قونسلۆسی جەزای لێ دەستێنێ[٤١] • خەریکە سەرلەنوێ حوکوومەتێکی[٤٢] کـــوردێ بێنێتـــە نـــاو • بـــە حوکوومـــەت دەڵـــێ ڕۆمـــی • لـــە ئـــەووەڵی حوکوومەتیانەوە تا سەرداری ئەکرەم ئەمجارە هاتووە حوکمیـــان بەسەرمانا بووە[٤٣] •

موتەســـەرریـــف :

ئافەرین ! تۆ پیاوێکی سادیقی دەوڵەتیو تێگەیشتووی کە ئیدارەی زۆردار ( ئاتارشی )و بێقانوونییە ، عەدالەتی تیا نابێ • تەفـــرەی خەڵك ئەدەن : هەی ئێمە وەتەنیو میللیو نازانم چیو چین ، کەچی

---

(٤٠) لەچاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «بڵێنە» • دیـــارە مەبەســـت (بڵێـــین)ە ـــ م •

(٤١) ئەم ڕستەیە لە چاپەکەی کاکەی فەللاحا بەرێنراوە ـــ م •

(٤٢) ئەم وشەی «حوکوومەتێکی»یە لە چاپەکەی کاکەی فەللاحا کـــراوە بـــە (شتێکی) • لامـوایە ئەمەیش هەر کاری ئەو برا پسپۆڕە بێ کە دەستووسی کتێبەکـــەی دراوەتـــە لا بـــۆ هەڵسەنگانـــدنی لـــەڕووی سیاســـەتی ڕاگەیێنییەوە ـــ م •

(٤٣) دوا ڕستەی ئەم برگەیە ئاڵۆزییەکی زۆری تیایەو مەعنایەکی ئاشکراو ڕۆشن نادا بەدەستەوە • لاموایە بێ بینینی دەستنووسی پیرەمێرد خـــۆی ساغ ناکرێتەوە ـــ م •

لەپێشدا هەرچی پیاوێکی بەناموسە لەناوی ئەبەن[٤٤] یا لەدەستی دەخەن ، هەرچی‌وپەرچی دەخەنەکار •

هفتــــی :

پاشام ! مەسئەلەی تەشکیلاتی حوکومەتی‌و ئیدارە زۆر موهیمە، باخوسوس تەرتیبی حودوود • پادشاهان‌و وەزیرە مەشهوورەکان کردوویانە • تەماشای تەئریخ بکەن دەولـەتی عوسمانی چ بـە عەدالەت‌و چ بە قووەت لە هەموو حوکوومەتی ئاسیا پێشترەو ، تائێستا ئیستینادی قووەتی هەمیشە بە عەشیرەت‌و تیمارو زەعامەت بووە • واقیعەن سولتان مەحموود عەسـکەری تـازەی هێنایـە مەیدان ، بەڵام بڕوانن لە سەراوردی تەئریخیـدا شـەڕی هەمـوو حودوودی شیروان‌و ڕەوان‌و چالدیران‌و فەتحی بەغدای سولتـان سولەیمان‌و مرادخان هەموو بە قووەتی عەشائیری ئێمـە بـووە • هێجگار لە حودوودا دەوڵەت بۆی موسکین نابێ هەمیشە کوردووی عەسکەر دابنێ ، ئەم نەوعە کەسانە دەکا بـە قائیمقـام قووەتـی کوردوویێکی پێ دێنێتە بەرهەم • بۆچ شوکری خوا ناکەین کە لە حودوودا ئێمە زێرکەوتە نین ! بارەها دیومانە کـــە هەمحـودوود دەستی بەسەرمانا بووبێ چۆن پەتی بۆ هەڵخستووین • ئێستـا مەحموودی سەلیم شیوەکەلـی لـە حودوودا ئاسایشی تەئمین کردووە ، خەرج‌وباجی حوکوومەتی هەمووی تەسلیم بە سندووق ئەبێ ، مسکین تەنها یەک شەخسێ دەناسێ • والی‌یە هەر حەیتەیەک بچێتە دێ‌یەک حوکمداری بێ نان‌و ئالیک‌و پێخەف‌و هەموو چشتێک بەخۆرایی لە مسکین بستێنێ‌و ، کە پارەی خەرجی لێ وەرگرتن

(٤٤) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «نەبەن» • دیارە لەوە هەڵەی چاپــە ـ م •

بیخواو بەقایا بەسەر دیهاتەوە بمێنێتەوە • ئێستا بەڕاستی ماڵو عەرزی مسکێن لە ئەمنیەتدایە • کە تەنها شەخسێ بێو کەسێکی تر نەتوانێ دەستدرێژی بکا ، ئەو تەنها شەخسە سەهلە • تائێستا مەحموودئاغا چمسکێنێکی سەربڕی ؟ لە بانەدا دەستئەبڕن • ئەوا فەرزمانکرد حوکوومەت مەحموودئاغای عەزڵکرد ، خۆ قودرەتو دەستەلاتێ کە لەناو عەشائیرو حودوودا هەیەتی هەر ئەوەو تا ئەو مابێ قائیمقامی لاوە ناتوانێ لە شاربازێردا حوکمبکا • بەڵێ ئەتوانن مەرکەز بهێننە سەری ئەزمڕ[٤٥] یا هەڕووتە کە لە شارەوە چاویان لێیە ، بەلام لە هەر دێیێك دانیشن حوکمیان تا حودوودی ئەو دێیە دەبێ • ئێستا حوکوومەت لە خاکی ئەجنەبیدا بەقەد خۆی حوکمو نوفووزی هەیە •

شێخ سەلام :

پاشام ! ئەم فکرە دەربارەی مەحموودی سەلیمئاغا لەتەرەف ئەو ئەشخاسەوە ئیلقا کراوە وادەزانن ئەگەر مەحموود نەبێ ئەمانە هەریەکە لە شاربازێر چەند دێیەك ئیجارە دەکەنو ڕمزو بێستانیان گران دەخەرسێننو[٤٦] بە قازانج دەگەن • هەریەکە دەبنە ئاغای دێیەك ، بیگارو بارەدارو هەرەوەزو هێلکەو مریشکیان بەسەر لادێییەوە دەبێو خۆیشیان هیچ فائیدەیێکیان بۆ حوکوومەت نابێ • بەهۆی موساعەدەی موتەسەڕیفێکەوە دەبنە سپلی لاورگ هەناسەی مسکێن دەبڕن • ئێستا ئەگەر بەحەق

---

(٤٥) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «ازمیر» • دیارە یا هەڵەی چاپ یا هەڵەی شێوەنووسینە ــ م •

(٤٦) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «دەخەسێنن» ، بەلام ڕاستی وشەکە (دەخەرسێنن)ە لە (خرص)ی عەرەبییەوە واتە : تەخمینکردن کە بەکوردی (خەملاندن)یشی پێئەڵێن لە جاوگی (تخمین)ی عەرەبییەوە ــ م•

تەماشا بکەین ئەم پیاوە لە هەموو قەلەمڕەوی شاربازێڕدا سەرخۆشی‌و قومارو دزی‌و زینای نەهێشتووە • جەزای بۆ نوێژنەکەریش داناوە کە ئەساسی قووەتی سەلتەنەتی عوسمانی دیانەتە • مەشهوورە سولتان عوسمان شەوێ لە شوێنێ میوان بووە لە ئۆدەیێکدا ، قورئانێ بە سنگێکدا هەڵواسترابوو ، تا ڕۆژ لەبەر حورمەتی قورئان ڕانەکشاوە • نەسرەت لە دیانەتدایە • قائیمقامێکی سەرخۆش دێ ، خۆیشی ڕسوا دەبێ‌و ، حەیسی‌یەتی حوکوومەتیش نامێنێ •

**موتەسەڕیف :**

کەوابێ تا قیامەت ئەم پیاوە لەوێ قائیمقام بێ !

**قازی :**

جا ئەگەر مەئموور لە ئیستیقبالی خۆی ئەمین بێ‌و بزانێ تا خدمەت بکا عەزل نابێ ، چاکتر نی‌یە لەوە کە سەلەفی جەنابتان دەیفەرموو: ئاخ ! چیبکەم • ئەگەر بمزانی‌یایە تا شەش مانگ لێرە دەمێنمەوە زۆر ئیشی بەئاسانم[٤٧] دەکردو هەر چوار دەوری شارم دەکرد بە باغ‌و درەخت ، ئەوسایە سلێمانی دەبوو بە بەهەشت • بەڵام هەر واتزانی یەکێکی‌تریان لەشوێن ناردم‌و ، هەرچیش من بیکەم ئەو هەڵیدەوەشێنێتەوە • ڕاستی فەرموو ، وەکی ئەم قائیمقامە سەرداری ئەکرەم هەڵیبژاردووەو هەموو موتەسەڕیفانی سەلەفی جەنابتان زۆری لێ مەمنوون بوون ، ئێستا ئێوە بیناغەی ئەوان دەڕووخێنن •

---

(٤٧) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا وا نووسراوە ، بەڵام مەعنای نایەت • دیارە هەڵەیەکی تیایە • دوور نی‌یە ڕاستەکەی «زۆر ئیشم بەئاسانی ••» بێ . کاکەی فەللاح لە چاپەکەی خۆیا کردوویە بە « زۆر ئیشی ئاسانم••» ، بەڵام ئەوە هێزی ڕستەکە ناهێڵێ – م •

موتەسەڕریف :

قازی ئەفەندی ! تەجاوز دەفەرموون ، ئەمە تەرەفداری‌یەو بەرتەحریکم دەکەن ،

قـازی :

خێر ، پاشام ! بەیانی حەقیقەتە ، تەرەفداری نی‌یە ، هەموو عالەم دەزانێ من لە حەیاتی خۆمدا موناسەبەتم لەگەڵ شیوەکەلی‌یان نەبوە ، نیهایەت منیش عەلاقەداری عەدالەتو ئیدارەم ، ئەوی بە خراپی بزانم مودافەعەی دەکەم ، ئەمە موغایری قانوونو عەدالەتە بە بێ‌جورم مەئموورێکی بلندپایە ئیتیهام بکرێو سەربەستیی حودوودو ئاسایشمان نەمێنێ ،

موتەسەڕریف :

کەوابێ مەجلیس خیتامی پێدرا ، ئێوە بڕۆن ، حوکوومەت کاری خۆی دەزانێ ،

مەجلیس هەڵدەستن ،

قـازی :

لە ڕێ سەر دەنێتە بناگوێی مفتی ، دەڵێ : ئەم باوەحیزە نی‌یەتی خراپە ، دەترسم مەحموود دەرمانخوارد بکا ، چار چی‌یە ؟ خەبەر بنێرن نەیەت ،

مفتـی :

قازی ئەفەندی ! فکرەکەت دروستە ، بەلام مەحموودئاغا هاتوودو لە کارێزی دایکی پاشا خێوەتی هەڵداوەو ، گوێم لێ بوو موتەسەڕریف ناردی ئێوارە تەنها خۆی بێ بەیەکەوە نان بخۆین ، کەسی‌ترم قوبووڵ نی‌یە ، ئەلبەتە جاسووسیشی لەسەر داناوە ،

ئەگەر ئێمە یا خۆمان بچین یا کەسێ بنێرین ، دەیزانێ • منیش زۆر سەخلەتم • سا بزانین خوا چی دەکا •

لە عەینی پەردەدا ، کــە هەیئەتــی مەجلیــس هەڵدەســتن ، موتەسەڕڕیف لەجێی خۆی دادەنیشێتەوە • لەبەرخۆیەوە دەڵێ : ئافەرین لەو بەگ‌و ئاغایانە[48] کە خەبەریان دامێ • ئەمانە خەریکن بە قووەتی مەحموودئاغاوە من دەرکەن • با جارێ مەحموودیان بۆ دەرمانخوارد بکەم ، ئەنجا دەزانم چی لەمان دەکەم •

لە زیلەکە ئەدا ، جەوهەرئاغای خدمەتچی دێ •

**موتەســەڕڕیــف :**

جەوهەر ، چیت‌کرد ؟

**جەوهەر**

(بە تورکی) : پاشــام ! وەعــدی پەنجا لیــرەم بــە مامــەلاوە دا ، قووبوولی نەکرد • بەڵام سوێندم داوەو ترساندوورشــمە لای کەس ڕاستی نەڵێ • ئێستا وەلئاغای قەهوەچیم بە بیست لیرە ئیقنــاع کــــردووە •

**موتەســەڕڕیــف :**

لەپێش ئاندا قەهوە بە هەموومان بــدا هیچــی تیا نەبــێ • پاشــێ نانخواردن کە قەهوە دێنێ ، لەپێشدا دلۆپــێ زەهر بکاتــە نــاو فنجانەکەی مەحموودئاغاوە لەسەر تەپسی بەجوێ دانێ‌و ، فنجانی ئێمەیش لەسەر تەپسی بێ • کە قەهوەی تێ‌کرد ، قەهوەی فنجانی

---

(48) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «لەو بەگ‌و ئاغایە••» دیــارە ئەوە هەڵەیە چونکە لەگەڵ « کە خەبەریان دامێ » ڕێک‌ناکەوێ • بۆیــە من بەوجۆرەم ڕاست‌کردەوە کە لەسەرەوە نووسراوە ــ م •

مەحموودئاغا کەمی تێکا بۆ خاتری بە یەك قوم بیخواتەوە • کە ئەو قەهوەی دا ، تۆ زوو وەرە بلێ لە دائیرەی حەرەم ئیشێکی زۆر عەجەلەت هەیە ، فەرموو !! ئەمانە زۆر چاك تێجرا بکە ، لێت نەشێوێ ، چونکە مەسئەلە زۆر موهیمە •

ئەمانە ڕادەسپێرێ• وەسمان قاپی دەلێ : پاشام ! مەحموودئاغا هات • موتەسەڕریف ئەچێ بەپیریەوەو ، بەبەشاشەتێکەوە دەست ئەخاتە سەرشانیو ، بەخێرهاتنێکی گەرمو بەلەزاکەتی دەکاو لەتەنشت خۆیەوە دایدەنێ •

موتەسەڕریف :

ئەی مەحموودئاغا ! سەعات چەند گەیشتیەجێو ، لەکوێوە دێیت ؟

مەحموودئاغا :

ئەمە نیوسەعاتە گەیوومەجێ • لەسەر کارێزی والیدەین • چونکو قەرەبالغ بووین حەزم‌نەکرد میوانی کەس بین •

موتەسەڕریف :

چاك‌کرد • بەڵام ئەم ئێوارەیە چونکو تازە هاتوون ، ڕەنگە هێشتا مەتبەخت تەواو پێ‌نەگەیشتبێ • زاتەن ئەووەڵ ئێوارە بەیەکەوە نان‌دەخۆین • عوسمان‌ئاغا ! بلێ ئەسپی ئاغا بەرلە تەویلە ئالیکی بدەنێ • مەیتەرباشیو قلیاندارو پێشخدمەتو چەند کەسێکی‌تریان بمێننەوە ، لە ئۆدەی ئەودیو نانیان بۆ دانێن[49] • ئێمە خۆمان ، ئاغاو مدیری تەحریراتو تابوورئاغاسیو ئەوڵای عەزیزئاغای ئەعزای ئیدارەو عەلی‌بەگ بەیەکەوە نان‌دەخۆین •

---

(٤٩) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «دانیین» • دیارە ئەوە هەڵەیەو ، ڕاستەکەی ئەبێ (دانێن) بێ • کاکەی فەللاحیش لە چاپەکەی خۆیا هەر وەك منی ڕاست‌کردووەتەوە ــ م •

ئەی مەحموودئاغا تا کەس لێرە نییە تێمبگەیەنە مەسەلەی دەرکردنی ئەمانوللا کوڕی کەریمخانی حاکمی بانە چییە ؟

مەحموودئاغا :

پاشام ! ئێمە لەگەڵ بانەدا دراوسێین . هەموو ئالووێرو خرێدوفرۆشتو تیجارەتی ئێرانمان بە واسیتەی بەندەری بانەوەیە . بانەیش لە زەمانی حوکوومەتی بەلیئەردەلانییەوە تا پێش کەریمخان حاکمی[50] کوردەواریی بووە هیچ فەرقێکی نەکردووە . کەریمخان داوای کارپەردازو پەساپۆرتو وزەی لە تەبەعەی ئێمە دەکردو دەستی دوو کەسی تەبەعەی عوسمانیی بڕیوو . یۆنسخان کە نائیبی حوکوومەت بوو لەنگەری بۆ ڕاگرتبوو . بەلام ئەمجارە کە دەستی ئەو پیاوانەی بڕی ، تەبەعەو شابەندەر گەلەکۆمەکیان لێکرد ، ڕایکرد . زاتەن یۆنسخان بەوەکالەت لەوێ ئیفای وەزیفە دەکا . هێشتا حوکوومەتی ئێران حاکمیتری نەناردووە .

موتەسەرریف :

ئەی تۆ بۆچی چووبوویتە بانە ؟

مەحموودئاغا :

من خۆم هیچکوێ نەچووم . مامەکالم بۆ خوازێنی چووبوولە بانە . من ئەگەر هەرچی بکەم ئایا خزمایەتیو ئایا موعاوەنەت ، لەگەڵ ئەمانەدا ، هەمووی بۆ تەقوییەی وەزیفەو ڕەواجی کاری حوکوومەتە . شوکر ، بەسایەی خواوە ، لە نوفووزی ئەجنەبی

(٥٠) لە چاپەکەی پیرەمێردو کاکەیفەللاحیشا هەر نووسراوە : «حاکمی» ، بەلام ڕستەکە بەوجۆرە مەعنا نادا بەدەستەوە . من هەرچەند لەوە دلنیا نیم کە ڕاستییەکەی چۆنە ، لاموایە ئەبێ (خاکی) بێ — م .

دەناسم ، نە ( کاپیتۆلاسیۆن ) • ئەمەیش سەربەرزیو حورمەتی ئێوەی تیایە •

**موتەسەڕریف :**

باشە ، من زۆر لە تۆ مەمنوونم • با بچینە سەر سفرە •

هەڵدەستن • لەپاشا دێنەوە • وەلیئاغا قاوە دێنێ • مەحموودئاغاو هەموو لایێ دەیخۆنەوە • بەڵام مەحموودئاغا لەگەڵ قاوە دەخواتەوە، ڕەنگی گرژ ئەبێو ئاگرێ دەچێتە دەروونیەوە • دەڵێ : ئەم ناوەیە چی بوو ؟ لەڕێی خوادا سووتاندمی • ڕووئەکاتە موتەسەڕریف دەڵێ : زۆر دەلەچەیت کرد •

لەوودەختەدا جەوهەر ئاغا بەپەلەپەل دێتە ژوورێ ، دەڵێ : پاشام! لە دائیرەی حەرەم ئیشێکی موهیم هەیە • موتەسەڕریف بە ڕاکردن هەڵدەستێ • مەحموودئاغا خەریك ئەبێ پەلاماری خەنجەری لێبدا ، دلی تێکەڵدێ[٥١] • پیاوەکان فریایدەکەون ، زوو ئەچن باباجالی حەکیم بانگ دەکەن • تا باباجان دێ کار لەکار ئەترازێ ، چاری تەداوی نامێنێ •

**مەحموودئاغا :**

ئاخ وەتەن ! ئاخ قەومی کورد ! منیشیان پێ ڕەوا نەدین • پەریچیهرە !! هەرچی ئێمە تەسەوورمانکرد خەیاڵبەتاڵ بوو • توخوا زوو لێرەم هەڵگرن • ئەگەر تا دەمگەیێنە خێوەتی خۆم زوبانم بشکێ ، بە براکانم بڵێن : زنهار ! لەسەر خوێنی من بەگژ

(٥١) هەرچەند وشەی (تێکەڵدێ)م لێرەدا بەمجۆرە نووسیوە ، وەك لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیو چاپەکەی کاکەی فەللاحیشا هەر وا نووسراوە ، لاموایە ڕاستەکەی ئەوەیە بە (تێکهەڵدێ) بنووسرێ ، چونکە (هەڵ)ەکەی پێشگری فیعلی (دێ) کەیەو ئەو (هەڵ)ە نییە لەگەڵ وشەی (تێك) پێکەوە وشەی (تێکەڵ) دروستئەکەن ـ م •

حوکوومەتدا نەچن . ئەم موتەسەڕریفە حەرەکاتێکی زۆر خراپی
کرد ، بەڵام ناحەقی نەبوو . لەو پیاوماقووڵانی وەتەنپەروەرە[٥٢]
کە حوکوومەتی ئەحمەدپاشایان ڕووخاندو پەری ئیستیقباڵی
کوردستانیان خنکاند ، دەربارەی من چشتێکی‌وایان هەڵبەستبوو
کە موتەسەڕریف لە خۆی ترساو پێشدەستیی کرد . ئەم
یادگارانە[٥٣] وەیانئەزانی کە ئەحمەدپاشا ئەما خۆیان جڵەوی
حوکوومەتیان بەدەستەوە دەبێ . کەچی ئەشباهیان[٥٤]
تەحسیلداری‌یان دەست‌ناکەوێ. ئێستاش بە خەیاڵی ئەمەن ئیجارەی
شاربازێر بکەن‌و دێهات بگرنە دەست خۆیان . ئەوە خەیاڵی
مەحاڵە . ئاخ ! کەریم‌و ڕەشیدو ئەوڕەحمانی کوڕم منداڵن ، بەڵام
هیوام بە ڕەسووڵی برامە . وەسیەت بێ : براکانم ، با گەورەتریش
بن ، هەموو لە ڕاو تەدبیری ڕەسووڵ دەرنەچن . ئینشائەڵڵا جێم
کوێرناکاتەوە . زینهار ! نەکەون لە سەودای موخالەفەتی

---

(٥٢) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : « وطنپرور» . من ئەو (ە)یەم لا پێویست‌بوو کە لێم زیادکردووە ، یا ئەبێ (لەو)ەکەی سەرەتای ڕستەکە (لە) بێ – م .

(٥٣) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «یادکارانە»و ، لە زۆر شوێنی کتێبەکەدا لەجیاتیی تیپی (گ) تیپی (ك) دانراوە . لام دوور لەڕێ ڕاستەکەی «بەدکارانە» بێ . خۆ ئەگەر ڕاست بێ‌و وشەکە هەر (یادگارانە) بێ ، لام‌وایە ئەبێ وای مەعنا لێ‌بدەینەوە کە ئەم جۆرە کەسانە بەم کردارە چەپەڵانەیان ئەوانەمان بیرئەخەنەوە کە لە مێژووی نەتەوەدا بەم‌جۆرە کاری خۆفرۆشی‌یانە ناسراون‌و وەك تابلۆیەکی دزێو لەسەر تەختەی بیرەوەریی جەماوەر نەخش بوون – م .

(٥٤) لە چاپەکەی پیرەمێرد خۆیا نووسراوە : «اشبهیانە» ، بەڵام ئاشکرایە هەڵەی چاپە – م .

حوکوومەت .. ئاخ ! چی بکەم ، بەختی کوردەواری ئەبوو ،
ئەوەی من ئەمویست و تەعقیبم ئەکرد خدمەتی وەتەن بوو . خدمەتی
وەتەنیش بە پشتئەستووری حوکوومەت ئەبی . هەرچی
حوکوومەت ڕووی لێ وەرگێڕا ، شێر بێ ، ڕێوی یە .

« تەواو بوو »

# ڕابەرێ بۆ ڕوونکردنەوەی
# هەندێ وشەو ناوی ناو شانۆنامەکە

( ئـ )

**ئاســار :**

نیشانە .

**ئالان :**

ناوچەیەکە لە قەزای شارباژێڕ .

**ئانارشی :**

ئاژاوەو هەراوهۆریاو نەمانی ڕێکوپێکـي لە ولاتا . بارو دۆخـی ولاتێ قانوونی تیا حوکمڕان نەبێ .

**ئۆتــــە :**

ئۆدە ، هۆدە ، ژوور .

**ئۆلکــــە :**

بەشێك لە ناوچەیەکی ولاتێك .

**ئەحمەد مەدحەت :**

(١٨٤٤ - ١٩١٢) ، ڕۆژنامەچي‌و ڕۆماننووسی تورك . سەرنووسی ڕۆژنامەی ( جریدەء عسکریە )ی عوسماني بووە ، لـە مالی خۆیدا چاپخانەیەکی دامەزراندووەو دەستی کردووە بە بلاوکردنـەوە . لە بابەتی ڕۆمـانو چیـرۆکو شانۆنامـەو وتـاری جۆربەجـۆری

زانستي ، نزیکەی دووسەد بەرهەمی نووسیوە • لە سەردەمی (تەنزیمات)دا کە بەرەو ڕۆژاوایی‌یانە بوون هەنگاوی ئەنا ، لە ئەدەبیات نووسینا بۆ خوێندەوارکردنی خەلك‌و بەرەوپێش بردنیان خزمەتی کردووە • ئەم ڕۆمانانەی : «فلاتوون بەگ‌و ڕاقیم ئەفەندي» ، « هێشتا حەڤدە ساڵانە » ، «خاتو دوڕدانە» بە تیپی لاتینی‌یش بلاوکراونەتەوە •

**ئەزمڕ :**

چیایەکە لە باکووری ڕۆژهەلاتی سلێمانی‌یەوە ، سەیرانگای هاوینانی خەلکی شارە • ڕۆژهەلاتی : ناوچەی چوارتاو ، ڕۆژاوای : سلێمانی‌و دەوروبەریەتی •

**ئەسحابەکوژ :**

بە بانەیی‌یان ئەوترێ ، چونکە وەختی خۆی شەڕی زۆریان لەگەل ئەسحابان کردووەو زۆریان لێ لەناوبردوون •

**ئەهلی سەلیب :**

گاورە بەشدارەکانی جەنگی سەدەکانی ۱۱ ـ ۱۳ی ز • لەنێوان گاورەکانی ئورووپاو موسولمانانی ڕۆژهەلاتی نزیکدا کە بەمەبەستی دەرهێنانی بەیتولمەقدیس لەدەست موسولمانان بەرپاکرا • لە یەکێ لە قۆناغەکانی ئەم جەنگەدا قارەمانی کورد سولتان سەلاحەددینی ئەیووبي بە خۆی‌و سوپای کوردەوە پێشەنگی لەشکری ئیسلام بوو و سەرکەوتنی مەزنی بەدەستهێناو بەشێکی زۆری ولاتی شام‌و فەلەستینی ـ بە قودسیشەوە ـ لەچنگ ڕزگارکردن •

**ئیجاب :**

پێویست بوونی شتێك •

ئیجارەدار :

ئەوەی زەویوزاری دەوڵەتي بە کرێیەکی ساڵانە بەکرێ ئەگرێ •

ئیختیارەددینـــی :

بنەماڵەیەك بوون لە پێش ئیسلامەوە حوکمڕانی بانە بوونو بە ئارەزووی خۆیـــان موسـولمان بـــوون ، بۆیـــە ناونـــراون (ئیختیارەددیني) • لە شەرەفنامەی بیتلیسیدا باسیان لێ کراوە •

ئیـــرادە :

فەرمانی سولتاني •

ئیستیقبال :

موستەقبەل ، دوارۆژ •

ئیستیناد :

پشتبەستن بە شتێ •

ئیلغای وەزیفە :

وەزیفە بەجێهێتان •

ئیلجـاري :

جاڕدان بەناو هۆز یا خزمو کەسوکارا بۆ داوای گەلەکۆمە بـۆ داکۆکي یا هێرشبردن •

ئیلقـــا :

خستنـــەدڵ •

( ب )

بابانـــەردەڵان :

ئەوکەسەیە میرنشینی بەني ئەردەڵانی دامەزراندووە • لە سەرەتادا لە سەردەمی چەنگیزخانییەکانا لە ناوچەی مووسڵو دیاربەکرو

ئەو دەوروبەرانە حوکمڕانیی کردووە ، پاشان بەرەو ناوچەی شارەزوور هەڵکشاوەو دەسەڵاتی سەربەخۆی خۆی بەسەر ئەو ناوچەدا سەپاندووە • لە دوادوایی سەردەمی چەنگیزخانی‌یاندا تەواوی ناوچەی کۆیەو هەریرو بابانیشی گرتووەتە دەستو ، لە سالی ٥٦٤ی ك• (١١٦٨ی ز•)دا قەلای زەلمی دروست کردووە • حوکمڕانێکی بیروباوەڕ پاكو دادپەروەر بووە •

**باباجانی حەکیم :**

میرزا بەدیعی باباجان کوڕی حسێن ، لە سەردەمی سلێمانپاشای باباندا هاتووەتە سلێمانیو ، لە ڕووداوی چاکبوونەوەی کوڕێکی پاشادا لەسەر دەستی ئەوا ، پایەیەکی بلندی دەسگیر بوومو بووە بە پزیشکی تایبەتیی میرەکانو لەقەبی (باباجان)ی بەسەرابڕاوە • تا پاش ڕووخانی میرنشینی بابانیش ژیاوە • وادیارە لە دەوروبەری ١٨٨٠دا کۆچی دوایی کردووە • دوکتۆر حسێنی کوڕیشی پزیشکێکی ناودارو شاعیریش بووە ، لە ئەستەموول خوێندنی تەواوکردووە • ئەم دوکتۆر حسێنە باوکی هونەرمەند (بەدیع باباجان)ە •

**بابـــان :**

میرنشینێکی کوردە سێ بنەماڵەیان یەك لەدوای یەك لە هەندێ ناوچەی کوردستانا حوکمڕانی‌یان کردووە • حوکمڕانیی بنەماڵەی سێهەمیان لە دواساڵەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا لەلایەن فەقێ ئەحمەدی دارشمانەوە دامەزرێنراوە لە ناوچەی پشدەرو ، لە سەردەمی سلێمان بەگی کوڕیا پێتەختی گوێزراوەتەوە بۆ (قەڵاچوالان) لە شارباژێڕو ، تا دروستکردنی سلێمانی لە سالی ١١٩٩ی ك • ( ١٧٨٤ – ١٧٨٥ ی ز • )دا لەلایەن

ئیبراهیم‌پاشاوه هەر ئەو گوندە پێتەخت بووه • ئەم میرنشینە لە سالـــی ١٢٦٧ی ك • (١٨٥٠ ـ ١٨٥١ی ز•)داو لـه سەردەمـــی ئەحمەدپاشای دوا میریا لەلایەن دەولەتی عوسمانی‌یەوە لەناوبراوە •

**بابـــەك :**

کوڕی ساسان • ماگییات [مەوبەد]ی پەرستشگـای ئاناهیتـای زەردەشتي بووە لە ئیستەخر [لەنزیك شیرازی ئێستاوە ] • کچـی میرێکی ناوچەکەی هێناوەو پاشـان لە ڕێگـای کوودیتایەکـەوە دەسەلاتی لە دەستی باوکی کچەکە دەرکردووەو خـۆی بووە بـه حوکمـڕان • ئەردەشێـری بابەکـان کە حوکمڕانیـی بنەمـالەی ساسانیی داناوە ، کوڕی ئەم بابەکەیە •

**باتمـان :**

ئەندازەی شەش هۆقە یا شازدە کیلۆو نیو بە کێشانە •

**بارەهـــا :**

زۆر جـار •

**بـــارێ :**

بارێی گەورەو بارێی بچووك دوو گوندی سەر بە ناحیەی سیوەیلی قەزای شاربازێڕن •

**بـــاز :**

دیســان • لەگـەل ئەوەیش •

**بانـــە :**

شارێکە لە کوردستانی ئێران • مەلبەندی بەشێکە لە شارستـانی سەقز ٦٦ کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژاوای سەقزموەیە • ژمـارەی دانیشتـووانی ١٥ ـ ١٦ هەزار کەسێك ئەبێ •

**باوجوود :**

هەرچەند ، لەگەڵ ئەوەیش کە ..

**بەختیـــاري :**

خێلێکە لە ناوچـەی (چەهـار مەحـاڵ)و (بەختیـاري) لە ئێـران نیشتەجێ‌یە ، ناوچەکەیان ناوچەیەکی دارستانەو زیاتـر خەریکـی حەیوانداریـن ، گەرمیانو کوێستـان ئەکەن ، شیـعە مەزەبـنو ٤٠ ـ ٦٠ هەزار بنەماڵەیەك ئەبن ، زمانیان یەکێکە لە دیالێکتەکانی زمانی کوردي‌و ، بەهۆی ڕەقەنی‌و سەختیی ناوچەکەیانەوە زمانی عەرەبي‌و تورکي کاری تێنەکردووە .

**بەر تەحریك کردن :**

هانی خەڵك لێدان .

**بـــەزەوي :**

بەزەیی .

**بەشاشـــەت :**

ڕووخۆشي .

**بەنـــدەر :**

ئاوەدانی‌یەکە لە قەراخی دەریا یا ڕووبارا کەشتیی تیـا لـەنگـەر ئەگرێ‌و باری تیا بارئەکەنو باری تیا دائەگرنو ڕێگای ئاوي بـە ڕێگای وشکانی‌یـەوە پێوەنـد ئەکـا . لـەم مەعنـاوە بۆ هـەر شـوێنێکی‌وایش وەرگیراوە کە خەڵکی بۆ کڕینو فرۆشتن بچنی‌و ناوچەیەك لەڕووی بازرگانی‌یەوە بیەستێتەوە بە ناوچەیەکی‌ترەوە ، وەك پیرەمێرد بە زمانی مەحمـوودی سەلیـم‌ئاغاوە لـە وەڵامـی موتەسەڕیفی عوسمانیی سلێمانیدا لەم شانۆنامەدا بەکاری‌هێناوە .

**بەنقەرەبینا :**

قایشی دەمانچەی (قەرەبینا) کە جۆرە دەمانچەیەکی کۆن بووە لـە دەمانچەی دەتیر درێژتر بووە باروۆتی تێکراوەو داگیراوە •

**بەنـەزمەی :**

بە چاوی • وەك •

**بەنی ئەردەلان :**

نـاوی ئەو میرنشینـە کوردەیـە بابائەردەلان دایمەزراند • بـە بنەماڵەی حوکمڕانی میرنشینەکەیش ئەوترێ • ئەم میرنشینە لـە قۆناغی گەشەکردنیا بەشێکی زۆری کوردستانی ئێرانو هەنـدێ ناوچەی باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی عێراقی ئێسـتای لەژێـر دەستا بووە • پێتەختی ئەم میرنشینە لە دوا سەدەکانیا شاری سنە بووە • ئەم میرنشینە لە ساڵی ٦١٧ی ك • (١٢٢٠-١٢٢١ی ز •)دا دامەزراوەو ، لە ١٢٨٤ی ك • (١٨٦٧ - ١٨٦٨ی ز•)دا لەلایـەن ناسرەددین شای قاجارەوە دوایی پێهێنراوە •

**بیدعـەتی سەیئە :**

دابونەریتی بێسوودو زەرەرمەنـد • وشەکـە لـە ئیستیلاحـی ئاینیدا بەمەعنای کارێ بەکارئەهێنرێ لە سەردەمـی پێغەمبـەرا نەبووبێو کردنی حەرام یا مەکرووە نەبێو بە سەنگو تـرازووی شەرع چاکەیەکی تیا نەبێ •

**بێکـــار :**

دەس بەتاڵ • ئەوەی کارێکی نەبێ خۆی پێوە خەریك بکا •

**بێکـــارە :**

هیچ لێنەهاتوو • ئەوەی کارێکی بۆ ڕانەپەڕێنرێ •

**بێگەبەگ :**

کوڕی مەئموونبەگ ، یەکێکە لە میرەکانی بەنی ئەردەڵان . گەورەی هەموو براکانی بووە . باوکی ناوچەی زەڵم و گوڵعەنبەر و شەمیران و هاوار و نەوسوودی پێ سپاردبوو . چلودوو ساڵ حوکمڕانیی کردووە . (مذکرات مامونبگ بن بیگەبگ) کە مامۆستایان مەلاجەمیلی ڕۆژبەیانی و شوکور مستەفا لە تورکییەوە کردوویانە بە عەرەبی و پەراوێزیان بۆ کردووە و لەچاپیان داوە مەئموونبەگی کوڕی ئەم بێگەبەگە دایناوە .

**بێهوودە :**

بێسوود .

## ( پ )

**پامال ، یا پامال :**

ژێرپێکەوتوو و بەپێکوتراوە .

**پەری :**

جنۆکەی مێینە . گیانی چەپەڵ کە دەست لە کەسێ بوەشێنێ . بە خواستن لە مەعنای ئەسڵییەوە بە ئافرەتی جوانیش ئەوترێ و ، لەم ڕێگایەوە بووە بە ناوی ئافرەت . بە خواستن لە مەعنای دووەمیشەوە و بە پێوەند لەگەڵ مەعنای ئەسڵی ، بە ئافرەتێ ئەوترێ کە دڵی کەسێکی بردبێ و ئەوکەسە دڵی ئاوی چووبێ .

**پەریچیهرە :**

ئافرەتێ ڕووی لە جوانیدا وەك ڕووی پەرییان وابێ . لێرەوە کراوە بە ناوی ئافرەت .

پی‌یه‌س [پی‌تیس] :

شانۆنامه •

(ت)

تاژان :

گوندێکه له کوردستانی ئێران له باشـــووری شـــاری بانـــه‌وه هه‌ڵکه‌وتووه •

تاژه‌بـان :

گوندێکه سه‌ر به شارستانی بانه له کوردستانی ئێران له نزیکی گوندی تاژانه‌وه •

ته‌پسـی :

ده‌فری پان و گوشاد بۆ چێشت تێکردن •

ته‌حسیلـداری :

کاری کۆکردنه‌وه‌ی خه‌رج و باج •

ته‌رجیحی عونسوری :

هه‌ڵاوێردنی مه‌ردمـی سـه‌ر بـه نه‌ته‌وه‌یـه‌ك به‌ســه‌ر مه‌ردمـی سه‌ر به نه‌ته‌وه‌یه‌کی‌ترا •

تـه‌سـه‌للا :

سه‌بووری • لاچوونی خه‌م له دڵ • گه‌ڕانه‌وه‌ی خۆشی بـۆ دڵ •

تیمـــار :

لـه ســه‌رده‌می عوســـمانیدا ده‌وڵه‌ت ده‌یـه‌کی زه‌وی‌وزاری میری ناوچه‌یه‌کی ئه‌دا به گه‌وره‌یه‌کی ناوچه‌که به‌رانبه‌ر به‌وه که ئه‌ویش هه‌رکاتێ داوای لێ بکرێ ژماره‌یه‌کی دیاری شه‌ڕکه‌ر ئاماده بکـاو

بی‌بانخاته تەك سوپاو بی‌بانئێری بۆ جەنگ • بەو دەیەکە زەویوزارە ئـەوترا : تیمار •

(ج)

**جوامێرئاغای ڕەنگینە :**

یەکێکە لە دوازەسوارەی مەریوان • پیرەمێرد لە ( دوازەسوارەی مەریوان )ەکەیا وای وەسپ‌ئەکا کە :

جوامێرئاغای ڕەنگینە

پلنگی چنگ بەخوێنە

**جەسارەتی مەدەنی‌یـە :**

چاونەترسان‌و شەرم‌نەکردن بۆ قسەی زۆرەکانەو بەجێ لە شوێنـی پێویست‌و لە بەردەم پیاوی گەورەدا •

**جیـازی :**

ئەو ناومال‌و کەلوپەلـەی بووك لەگەل خـۆی ئەیبا بۆ مالی نوێـی خـۆی‌و زاوا •

**جینسی لەتیف :**

ئافـرەت •

**جیهـاد :**

غەزا [ شەڕی موسولمانان لەدژی کافران لەپێناوی ئاینا ] •

**جیهاندیـدە :**

دنیادیتوو ، بەتەجرەبە •

## ( چ )

**چاپـاو :**

فروستاده ، نامەبەر • (چەپەر)یشی پێ ئەڵێن •

**چالدیـران :**

ناوی کۆمەڵە دێهاتێکە لە هەرێمی ( سی‌یەهـ چەشمە ) لە شارستانی (ماکۆ) لە ئازربایجانی ئێـــران • شــــەڕی چالدیرانــی نێـوان شائیسماعیلی سەفەوی‌و سولتان سەلیمی عوسـمانی لـە سـالی ٩٢٠ی ك • ( ١٥١٤ ـ ١٥١٥ی ز • )دا لـەوێ ڕوویداو لەشکری شائیسماعیلی تیا شکاو لەئەنجامی ئەوەدا شائیسماعیل دەستی لـە ئەرمینیاو کوردستان هەلگرت بۆ عوسمانی •

## ( ح )

**حەمایەل :**

چەرمێکە ڕاست‌وچەپ لەمل‌ئەکرێ‌و کیفێکی چەرمی پێوەیە ، جا دوعا یا پارە یا شتی‌تری تێ‌ئەخرێ • لەم کتێبەدا بەمەعنای ئـــەوە بەکارهاتووە کیفێکی‌وای پێوەبێ وەك کیلانی شمشێری تێ‌بخرێ •

**حەیاتی وەحشەت :**

دوور لە خەڵك‌و وەك دڕندە بەتەنها ژیان •

**حەیتـە :**

پیاوی بەردەستی ئاغا •

**حەیسیەت :**

شەرەف‌و حورمەت •

**حیرەت :**

سەرسامی •

**حیسسی ئیجتیماعی :**

هەستی کۆمەلایەتی •

**حیسسیات :**

ئیحساس ، هەستکردن •

**( خ )**

**خـــارا :**

جۆرە پارچەیەکی ئاوریشمە ، (غارا)یشی پێئەلێن •

**خرید وفرۆخت :**

کرین وفرۆشتن •

**خـــوره :**

نەخۆشییەکی کوشندەیە ئەدا لە پێــستو داینەرزێنێ •

**خەرج :**

ئەو باجەی دەولەت بەرانبەر بە هەرچی لەســـەر هاولیشتمالــی دائەنێ •

**خەرۆیی :**

بابی بوون •

**خەنەبەندان :**

کۆبوونەوەی ژنانی شەوی پێش بووکبردن کە خەنە ئەگرنە دەستی بووکو کیژان •

## ( د )

**دانــا :**

زاناو فامیده •

**دوێت :**

دەوات ، شووشەی مەرەکەبی پێنووسین •

**دەبلەبە :**

دەنگی کەوتن‌و لەزەوی‌دانی توندی سمی ئەســپ‌و شتـــی‌وا •
دەنگی تەپڵ‌و دەهۆڵ • گەورەیی‌و شانوشکۆ • لەم کتێبەدا بـۆ
ئەم واتای دوایی‌یە بەکارهێنراوە •

**دەربار :**

بارەگای پادشایان‌و میران • کۆشکی ڕەسمیی شا •

**دەلەچەیی :**

پەستی‌و مێچکەمێچکەکردن بۆ ئەم‌وئەو •

**دیاربەکر :**

شارێکە لە کوردستانی تورکیا ئەکەوێتە قەراخـــی ڕووبــاری
دیجلەوە ، زوو ناوی (ئامێد) بووە • پتر لە سەدهەزار کەسی تیـا
ئـەژی •

## ( ڕ )

**ڕابیتە :**

پێـوەنـدي •

**ڕاهوڕەسم :**

دابونەریتی لەناو خەڵکا باو •

**ڕۆینی :**

جۆرە هەڵپەڕکێیەکی ئارامە ، کـە هەڵپەڕکێکەر لـە هەڵپەڕکێـی فەتاح‌پاشایی‌و سێ‌پێیی ماندوو ئەبن ، بۆ حەسانەوە ، بەوجـۆرە هەڵئەپـەڕن • وایش ئـەبێ لـەپێشانـا هەڵپـەڕکـێ بەمجـۆرە دەست‌پێ‌ئەکـرێ ، جا کـە خەڵکەکـە گەرم‌داهاتـن ئەیکـەن بـە فەتاح‌پاشایی یا سێ‌پێیی •• (ڕۆینە) یشی پێ ئەوترێ •

**ڕەعییەت‌نەوازی :**

میهرەبانی‌کردن‌و لوتف‌نواندن بەرانبـەر بـە خەڵکـی ژێردەسـتە لەلایەن پادشای وڵات یا ئاغای خاوەن‌موڵکی دێوە •

**ڕەفیقە :**

هاورێ • هاوسەر • ژنی مێرد •

**ڕەنگینـە :**

گوندێکە تابیعی مەرکەزی قەزای شارباژێرە •

**ڕەوان :**

ناوی کۆنی شاری یەریڤانی پێتەختی کۆماری ئەرمینیایە •

**( ز )**

**زەمەمە :**

تیماری گەورە [بڕوانەرە : تیمار ] •

**زەمانی سەعادەت :**

بە سـەردەمی ژیانی پێغەمبەر ئـــەوترێ بەوپێیە کە سـنوورێکی لـــەنێوان بت‌پەرستی‌و خوابەیەکزانیـا دانـا ، ئەگینـا تێـکڕای سەردەمی ئیسلامەتی ئەگرێتەوە • بـەرانبـەر بـە ئیـسـتیلاحی

زەمانی نەزانی (جاهلیة)ە کە بۆ سەردەمی بتپەرستیی عەرەبی حیجازو پێش هاتنی ئاینی ئیسلام بەکارئەهێنرێ •

**زیندەگانی :**

ژیان • ئەو شتانەی ژیانیان پێ بەڕێوەئەچێ •

**زیندەوەر :**

گیانلەبەر •

**زینهـار :**

خۆت لەم شتە پارێزە • خۆتی لێ دووربگرە •

(س)

**سادیق :**

ڕاست •

**ساسان :**

پیاوماقوولێکی خەڵکی پارس بووە ، لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەمی زایندا ژیاوە • سەرەکی پەرستشگای ئەناهیتای زەردەشتی بووە لە ئیستەخر • بنەماڵەی ساسانی ئەچنەوە سەر بابەکی کوڕی ئەم ساسانە •

**سالم :**

عەبدوڕڕەحمان بەگی بەناوبانگ بە سالمی ساحێبقران یا سالمی سلێمانی (چونکە سالمی سنەیش هەیە) • شاعیری گەورەی کورد لە نیوەی دووەمی سەردەمی بابانیەکاندا • دیوانە شیعرێکی لەچاپدراوی هەیە •

**سرۆچك :**

ناوچەی بەرزنجەی ئێستا لە شارستانی سلێمانی • لە مێژووی کوردستانی سەردەمی بەنیئەردەلانو بابانـدا کەلی چار نـاوی قەلای سرۆچك ، وەك مەلبەندێکی حوکمڕانیو جەنگاوەری ، دووبارە ئەبێتەوە •

**سلێمانبەگ :**

کوڕی میرزابەگ ، یەکێکە لە میرە ئیختیارەدینیەکانی بانە • بەیارمەتیی شاتەهماسیی سەفەوي لەجێی بۆداقبەگی بڕای کـە لەلایەن دوو بڕای باوکییەوە لە حوکمڕاني دوورخرابـووەوەو لـە قەزوین کۆچی دوایی کردبوو ، بووە بە حوکمڕانی بانەو بیست ساڵ حوکمـی کـردووەو ولاتـی ئاوەدانکردووەتـەوەو پێشیخستووەو زانستو دادپەروەریی بڵاوکردووەتەوە • پاشان دەستی لە حوکمڕاني هەڵگرتووە بۆ بەدربەگی برازایو چووە بۆ مەدینەو لەوێ ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کـردووە • ئـەم میـرە هاوچەرخی شەرەفخانی بیتلیسیی خاوەنی (شـەرەفنامە) بووە •

**سلێمـانی :**

یەکێکە لە شارە بەناووبانگەکانی کوردستـان • ئێستا مەلبەنـدی شارستانێکە بە ناوی شارستانی سلێماني ، کە یەکێکە لە هـەژدە شارستانەکەی عێراقی ئەمڕۆ • ئیبراهیمپاشای بابـان لە سـالی ۱۱۹۹ی ك • (۱۷۸٤ ـ ۱۷۸٥ی ز • )دا دروستیکـــــردووەو کردوویە بە پێتەختـی میرنشینـی بابـان • لە چەرخـی نوێشـا پێتەختی حوکمڕانیی شێخ مەحموود بووە • مەلبەندێکی گەورەی ڕۆشنبیريو نیشتمانپەروەریی ئەم سەردەمەی کوردە •

**سنە (سنندج) :**

یەکێکە لە شـــارە گەورەکانـــی کوردستـــان • ناوچەکـــەی دەوروپشـتیشی هەر بەم ناوە ناوئـەبرێ • کەوتووەتـە ڕۆژاوای کوردستانی ئێرانەوە • ناوچەی سنــە ناوچەیەکـی پڕدەغلـودانێو بەپیتو بەرەکەتە • سنە سەردەمێکـی زۆر پێتەختـی میرنشـینی بەنیئەردەلانو هەروا مەلبەندێکی گەورەی کولتووری ئیـسلامي بـوود • ناوچەی سـنە ئێـستا لـە هەشت بەشو سێ کۆمـەڵـە ئاوایي پێکهاتووە کە ١٢٤١ گوند ئەگرێتەوەو نزیکـەی چارەکـە ملیۆنێ خەلکیان تیا ئەژي • شاری سنە خۆی نزیکەی سەدهەزار کەسی تیا ئەژي • قالیی ئاوریشمو بەنی زۆر نایاب لە ناوچەی سنە دروستئەکرێو هەروا بە سنعاتکاریی دارو تەختە بەناووبانگە •

**سوپاه :**

لەشکـــر •

**سولتان سولەیمان :**

یەکێکە لە سولتانە ناودارەکانی عوسماني • بە سولەیمانی قانوونی بەناووبانگە • لـە ٩٢٦ی ك • (١٥٢٠ی ز • )دا لەســـەر تـەختی سـەلتەنەت دانیشتووەو ، لە ٩٧٤ی ك• ( ١٥٦٦ ی ز • )دا کـۆچی دوایی کردووە • زۆر شارو ناوچەو وڵاتی لە ئورووپـا داگیـر کردووەو بەسەر زۆر لە پادشاکانیـــا زاڵبـــووە لە جەنگـــا • دەسەڵاتێکی زۆری لە دەریای سپیی ناوەڕاستیشا بووە •

**سولتان مراد :**

پێنج لە سولتانەکانی عوسماني ناویان سولتان مـرادە • وادیـارە مەبەست لەوەیان کە ناوی لەم کتێبەدا هاتووە یا سولتان مـرادی سێهەمە کە لە سالی ٩٨٢ی ك • (١٥٧٤ی ز•)دا چووەتە ســەر

تەختو ، لە ٩٨٤ی ك•(١٥٧٦ی ز•)دا بەسەر لەشکری ئیرانا زالبووەو گورجستانی لەدەست دەرهیناوەو ، لە ١٠٠٣ ی ك• (١٥٩٥ی ز•)دا کۆچی دوایی کردووەو ، هاوچەرخی سێ پادشای سەفەوی : شائیسماعیلی دووەمو ، سولتان موحەممەدی خودابەندەو ، شاعەبباسی گەورە بووە ؛ یا سولتان مرادی چوارەمە کە لە سالی ١٠٣٢ی ك • (١٦٢٣ی ز•)دا چووەتە سەر تەختو ، لە ١٠٤٧ی ك • (١٦٣٨ی ز •)دا بەغدای لە دەستی ئیرانیەکان دەرکردووەو ، لە ١٠٤٩ی ك • ( ١٦٤٠ی ز •)دا کۆچی دوایی کردووە •

**سولتان مەحموود :**

سولتان مەحموودی دووەمی عوسمانی کە لە سالی ١٢٢٣ی ك • (١٨٠٨ی ز •)دا چووەتە سەر تەختو ، لە ١٢٤٢ی ك • (١٨٢٦ی ز •)دا لەشکری (ینیچیری)ی قرتێخستو سوپای عوسمانیی بە شێوەیەکی نوێ ڕێکخستەوەو ، لە ١٢٥٥ی ك • (١٨٣٩ی ز •)دا کۆچی دوایی کردووە •

**سوورکێو :**

شاخێکی بەرزە لەسەر سنووری عێراقو ئێران لە ناوچەی بانە •

**سەحنە :**

مەیدان • تەختان • لەمکتێبەدا مەبەست دەوروبەری ئەو زوورەیە میوانەکەی تیا بووە •

**سەراسیمە :**

پەرێشان • سەرلێ شێواو • گێژ • سەرسام • سەر لێتێکچوو • سەرگەردان •

**سەراورد :**

سەرەتاو بنەوانی هەرشتێ • ڕابوردووی پێشین •

**سەرئەفراز :**

سەربەرز • ڕزگار •

**سەرکار :**

ئەوەی کاروباری کەسێکی بەدەستەوەیە • وشەیەکە بۆ ڕێزلێنان ئەخرێتە پێش نیشانەی ناوی کەسێکەوە ، وەك (سەرکاری ئاغا ، سەرکاری خانم ، سەرکاری ئێوە) •

**سەقز :**

ناوچەیەکو شارێکیشە بە هەمان ناو لە کوردستانی ئێران • ناوچەکە نزیکەی ۱۱۵ هەزارکەسو ، شارەکەیش پتر لە ۳۰هەزار کەسی تیا ئەژی •

**سەلەف :**

کەسێ یا وەچەیێ سەردەمی لەپێشتر بێ •

**سەلەم :**

کڕینو فرۆشتنی دەغلودانو میوەو شتیوا بەسەوزیێ بە نرخێکی هەرزانتر لە نرخی پاش پێگەیشتنی • بەکوردی : سەوزخۆر •

**سەنایعی نەفیسە :**

هونەری جوانی وەك مۆسیقاو وێنەو شتیوا •

**سەودا :**

کەلکەلەو خەیاڵو ئارەزوو •

**سیاگوێز :**

دێیەکی سەر بە قەزای پێنجوێنە •

**سیوەیل :**

هەرێمێکی سەر بە قەزای شاربازێڕە •

## ( ش )

**شابالْشا :**

ناوی شای پەرییانە ، بووە بە کینایە لە جوانی •

**شابەندەر :**

قونسلۆس ، نوێنەری دەولەتێ لای دەولەتێکی تر بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری ولاتەکەیو چاودێری هاونیشتمانانی لە ولاتی ئەو دەولەتەدا • لە ڕیزی نوێنەرانی ولاتانا لە ولاتانی تر ، پلەی شابەندەر لە خوار پلەی بالیۆزو وەزیری پێسپاردەوەیە • وشەی (شابەندەر) لە بنەڕەتا وشەیەکی فارسییە لەوەوە هاتووەکە لەسەرەتادا ئەم جۆرە نوێنەرانە لەو شارانەی کەلەسەر دەریا دانیشتوون کە ڕێگای بازرگانیی ناوییان لەسەرە • لەبەر دەسەلاتی زۆریشیان ، چونکە زۆربەیان نوێنەرانی دەولەتانی دەسەلاتداری ئورووپایی بوون لە ولاتانی لەچاو ئەوانا بێدەسەلاتی وەک ئێرانو عوسمانی ، وەک شای شاری بەندەر سەیریان کراوەو ، ئەم ناوەشیان هەر لەمەوە بۆ داتاشراوە •

**شاربازێڕ :**

قەزایەکی سەر بە شارستانی سلێمانییە ، ئەکەوێتە باکووری ڕۆژهەلاتیەوە ، مەلبەندەکەی (چوارتا)یە •

**شارەزوور :**

دەشتێکی پانوبەرینی بەفەڕو پیتو حاسلخێزە ، لە شارستانی سلێمانی لە کوردستانی عێراقو ، بەشی زۆری لە چوارچێوەی

( ناحیەی شارەزوور ) دایە لە قەزای هەڵەبجە . مەڵبەندی ناحیەی ناوبراو شاری ( سەیدسادق )ە .

**شێخ سەلامی قازی :**

یا مەلا عەبدوسسەلامی قازی ، ئەوەی لەبارەیەوە ئەیزانین ئەوەندەیە کە لە سەردەمی مفتیەتیی مەلائەحمەدی چاومارا قازیی سلێمانی بووە . لە هەندێ بەڵگەی دەستنووسی لای کاک عەبدورڕەقیب یوسفیشدا ئەم زانیارییانە لەبارەیەوە هەن :

(١) مۆرێکی بە بەڵگەنامەیەکەوە لەژێریا نووسراوە : « النائب بلواء السليمانية السيد عبدالسلام»و ، مێژووی ١٢٨٠ی ك . (١٨٦٣ ـ ١٨٦٤ی ز.)ی لەسەر دانراوە . وادیارە مەبەست لەم وشەی (النائب)ە جێنشینی شێخولئیسلامی ئەستەموول بێ لە لیوای سلێمانی .

(٢) ئیمزای لەسەر بەڵگەنامەیەك بە مێژووی ١٢٨٥ی ك (١٨٦٨ ـ ١٨٦٩ی ز.)و لەگەڵیا نووسراوە : «المولیخلافة بلواء السليمانية السيد عبدالسلام» کە ئەبێ مەبەست « المولی الخلافة » بێ بە واتای جێنشینی یێسپێرراوی شێخولئیسلامی ئەستەموول لە لیوای سلێمانی .

(٣) مۆرێ لەسەر شەجەرەی بنەماڵەی مەلا مارفی قازیی کوڕی مەلا ڕەسووڵ [باوکی ڕەمزی مەعرووفی شاعیر] بۆ شایەتی دان بە ڕاستیی ئەو شەجەرەیەو ، لەسەری نووسراوە : «الحقير السيد عبدالسلام القاضي بسليمانية» واتە : ناچیز سەید عەبدوسسەلامی قازی لە سلێمانی ، بەڵام مێژووی لەسەر نییە .

مزگەوتی شێخ سەلامیش لە گەڕەکی کانیئاسکانی سلێمانی بە ناوی ئەم زاتەوەیە کە دەرزی تیا وتوەتەوە .

**شیروان :**

ناوچەیەکە لە ئازربایجانی ڕۆژهەلات لە ئێران ، مەلبەندەکەی شارێکی بچووکە ئەویش هەر شیروانی ناوە .

**شیفتە :**

کەسێ گرفتاری خۆشەویستیی کەسێ بووبێ . عاشق .

**شیوەکەل :**

گوندێکە سەر بە ناحیەی سیوەیلی قەزای شارباژێڕ .

## ( ع )

**عائیلەوی :**

شتی یا کاروباری ناو خێزان .

**عەزیزبەگی بابان :**

یەکێکە لە میرزادەکانی بابان . پاش ڕووخاندنی میرنشینی بابان لەلایەن عوسمانلییەکانەوە قایل نەبوو ملیان بۆ بخەوێنێ ، لە قەلای سرۆچك پەنای گرتو دەستیدایە بەربەرەکانێی داگیرکەران، بەلام سەرەنجام نەیتوانی خۆی ڕابگرێو درێژە بە بەربەرەکانێکەی بدا ، تاقەسوارە بۆی دەرچوو و ڕووی کردە ناوچەی زەهاوو لەوێ نیشتەجێ بوو و هەر لەوێیش کۆچی دوایی کرد . وابزانم هەر ئەم عەزیزبەگەیشە شاعیری مەزنی کورد سالم چەکامەیەکی بەرزو بالای لە پیاهەلدانی بەربەرەکانێ کردنیا لەڕووی داگیرکەرانا هۆنیوەتەوە . ئەم پیاوە شایانی ئەوەیە مێژوولووسو فۆلکلۆریستانی کورد لە سەرگوزەشتی بکۆڵنەوەو ، ئەدیبانیش بە ڕۆمانو شانۆنامە لەسەرنووسین یادی زیندوو بکەنەوە .

**عیشوەباز :**

ئافرەتێ بە جۆرێکی نازەنینانەی‌وا بجوولێتــەوە دڵــی دڵــداران کەمەندکێشی خۆی بکا •

( ف )

**فەراغەت :**

دەس‌بــەتــاڵي •

**فیتنەجۆیی :**

لە ئاژاوەو هەرانانەوە ـ گەڕان •

( ق )

**قۆشەنی دیواني :**

لەشــکری تایەتیی دەوڵەت • بەرانبەر بە لەشکــری غەیرەنیزامــي بەکارهێنراوە •

**قەباڵە :**

بەڵگەنامەی مۆرکراوو شایەت لەسەرگیراوی ئیسپاتکردنی هەر شتێ • بزیاتر بۆ بەڵگەنامەی مۆرکراوو شایەت لەســەر گیــراوی ئیسپاتکردنی کڕین‌و فرۆشتنی موڵك بەکارئەهێنرێ •

**قەلەمــە :**

پارچەیێ لە وڵات • ناوچە •

**قەرنی ئەخیر :**

سەدەی دوایي • لــەم کتێبــەدا بــە واتــای ســـەدەی نۆزدەهــەم بەکارهێنراوە •

**قەلەمرەو :**

شوێنێ دەسەلاتی حوکمڕانێکی بگاتێ یا قسەی ئەوی تیا بڕوا .

**لەنەوز :**

قوماشێکی لووس‌و تەنك‌و بریقەداری ئاوریشمە .

( ك )

**کاپیتۆلاسیۆن :**

خەلکی ولاتێ لە ولاتێکی تر بژین‌و مافی ئەوەیان بێ لە دادگای ئەو ولاتەدا نا ، لە دادگای تایبەتیی سەر بە ولاتی خۆیانا داوەری بکرێن .

**کاربەرداز :**

کارڕاپەڕێن ، ئەوەی بەجێهێنانی کارێکی لەئەستۆدا بێ . جاران کە هەندێ دەولەتی ئورووپایی مافی کاپیتۆلاسیۆنیان لە ولاتە بێدەسەلاتەکانی ڕۆژلاتا بووە ، دەولەتی ئەم ولاتانە یەکی یەکێ یا چەند کاربەدەستێکیان لە شارە بایەخدارەکانی خۆیانا داناوە پێوەندیان بە قونسلۆسی ئەو دەولەتە بێگانانەوە بووە لەو شارانەدا ، بۆ داکۆکی لە مافی هەر هاوولاتێکی خۆیان کە لەگەل هاوولاتێکی دەولەتە بێگانەکە دەعوایەکی لە بەردەم دادگای سەر بە دەولەتە بێگانەکە لەو ولاتەدا ـ بووبێ ، واتە جۆرە دادیار (محامي)یەك بووە دەولەتی ئەو ولاتە بۆ داکۆکیکردنی لە مافی هاوولاتەکەی خۆی لە بەردەم دادگای دەولەتە بێگانە مافی کاپیتۆلاسیۆندارەکەدا ـ داناوە .

ئیستیلاحی (کاربەرداز) کە پیرەمێرد لە فارسییەوەی هێناوە ، لەو زمانەدا بۆ ئەو جۆرە کاربەدەستانە بەکارهێنراوە ، بەلام لای

پیرەمێرد خۆی ئەم مەعنایە نا ، مەعنایەکی نزیك لەم مەعنایەوە ئەگەیەنێ کە ئەوەتە دەولەتی عوسمانی کەسێکی لە شوێنێکی وەك (بانە)ی هاوسنووری ناوچەی شیوەکەلی قەلەمڕەوی مەحموودئاغای قایمقامی شاربازێڕ بێ ، لەجیاتیی هاونیشتمانانی لە ناوچەکەدا کاروباریان لای دەولەتی بالەو لە بانە بەسەربکاتەوە ، کە دیارە ئەمەیش ئەکێشێتەوە بۆ قەدەغەکردنی توانی هاتوچۆی خەلکی شاربازێڕ خۆیان بۆ بانە بۆ کاروباری کڕین و فرۆشتن و مامەلەی تری سەربەخۆی ئاوبازاڕیان لەوێ کە تا ئەو سەردەمە بەئازادی هاتوچۆیان کردووەو سنوور نەبوە بە کۆسپ لە ڕێیانا .

کارێزی دایکی پاشا ، کارێزی والیدە :

لە سلێمانییەوە کە ئەچووی بۆ سەیوان ، لە سەرکارێز تێپەڕ نەئەبووی ، لەو شوێنەدا کە تا ئەم سالانەی دوایش مالی عەزمی بەگی بابان و باخەکەی بوو ، بە دەستی چەپا بە چەند هەنگاوێ ، ئاوێ لە عەرزەکەوە هەلئەقولاو ئەڕژایە ناو شیوەکەی ئەوناوەوە . خەلکیش لێیان ئەخواردەوەو لێیشی ڕاکێشرابوو بۆ مالی عەزمی بەگ و باخەکەی . ئەو شوێنە کارێزی دایکی پاشایان پێ ئەوت کە دیارە ئەبێ دایکی یەکێ لە پاشاکانی بابان لێی دابێ و . مەحموودئاغای شیوەکەل لە گفتوگۆکەیا لەگەل موتەسەڕیف بە ( کارێزی والیدە )ی ناوبردووە .

گوردی :

شاعیری تەڕزمان و دەمپاراوی بەناووبانگی کوردی نیوەی دووەمی سەردەمی حوکمڕانیی بابانەکان مستەفابەگی مەحموودبەگی ئەحمەدبەگی ساحیبقران و ئامۆزای ئەوڕەحمانبەگی سالم . دیوانێکی ناتەواوی یەکەمجار لە ١٩٣١دا لە بەغدا لەچاپدراوە .

**کەبانوو :**

کەیبانوو •

**کەریمخانی بانە :**

دوا حوکمڕانی بنەماڵەی ئیختیارەددینییەکانە لە بانە • یۆنس‌خانی خزمەتکاری کوشتیو خۆی لەجێی دانیشت • بەڵام زۆری لەبرد ئەمیش بەدەستی فەتاح‌بەگی برازای کوژراو حەمەخانی کوڕی یۆنس‌خان لەجێی بوو بە حوکمڕان •

**کەلیخان :**

کێوێکە لەنێوان شاری بانەو سەقز لە کوردستانی ئێران •

**کەماڵ :**

وێڵو کەماڵو تێگەیشتوویو پێگەیشتووی •

**کەمەربەستە :**

کەسێ هەمیشە ئامادە بێ بۆ خزمەتکردنی کەسێ •

**کەندەسووورە :**

گوندێکی سەر بە شاری بانەیە لە کوردستانی ئێران •

**کێوی قاف :**

کێوێکی ئەفسانەییە ئەڵێن دەوری زەویی داوەو ، هەمووی پیرۆزەی سەوزەو ، سەوزیی ئاسمان لە ڕەنگی ئەوەو ، بنەمای هەموو کێوەکانی جیهانەو باڵاپیاوێ لە ئاسمانی جیائەکاتەوە • هەندێکیش ئەڵێن لەودیویەوە خەڵکێکی زۆرو جیهانێکی تریوا هەیە خوا خۆی نەبێ کەس نازانێ چین •• هەڵدێ لەوانەی مەعنای قورئانیان لێداوەتەوە ئەڵێن مەبەست لە تیپی (ق) لە ئایەتی (ق • والقرآن المجید)دا ئەم کێوەیەو ، هەندێکی کەیش ئەڵێن

یەئجووج‌و مەئجووج لەپشت ئەم کێوەوەن‌و ، ئەسکەندەری زولقەرنەین شوورەیەکی بەسەر ئەم کێوەوە دروست‌کردووە رێی لە یەئجووج‌و مەئجووج گرتووە بێنە ئەم دیوەوە • هەلێ لێکۆلەرەوی تازە بابەتیش ئەڵێن مەبەست لە کێوی قاف چیای قەوقازە • قسەی‌تری لەم بابەتانەیش زۆر کراوە •

( گ )

**گزیر :**

بەرپرسی کاروباری گوند •

**گۆران :**

ئێستا ناوی هۆزێکی کوردە لە هەرێمێ هەر بە ناوی (گۆران) لە ناوچەی کرماشان دائەنیشن لە کوردستانی ئێران • ئایینیان (عەلیەللایی)یەو ، شەش‌هەزار خێزانێ ئەبن‌و ، خێلی (قەڵخانی)و (تەنگچی)و (گەهوارە) بەشێکیانن • ئەمانە بە دیالێکتی (گۆرانی) ئەدوێن کە ئەدەبیاتێکی کلاسیکی فرە دەوڵەمەندی هەیەو بەدرێژایی چەند سەدە جوانترین شیعری کوردیی پێ وتراوەو ، بە ریشەی دیالێکتی هەورامی‌و زەنگنەی ئێستا دائەنرێ • بەڵام ناوچەی گۆران‌نشینی کۆن بەشێکی زۆری کوردستانی ئەو سەردەمەی وەك شارەزوورو هەورامان‌و مەریوان‌و جوالرۆو گۆرانی ئێستای گرتووەتەوە • لە لایەکی‌ترشەوە وشەی (گۆران) ، بەرانبەر بە (کورد) کە لەناو جافەتی‌یا واتە : رەشماڵ‌نشین‌و گەرمیان‌و کوێستان‌کەر ، بە مەعنای نیشتەجێ‌و بەکشتوکاڵەوە خەریك بەکارئەهێنرێ •

گیوی گۆدەرز :

یەڵێکە لە پاڵەوانەکانی داستانە ئێرانی‌یە کۆنەکان ۰ زاوای ڕۆستەمی زاڵو باوکی بیژەنە ۰ گیو بۆ گەڕان بەدوای کەیخوسرەوا چوو بۆ توورانو پاش حەوت ساڵ دۆزی‌یەوەو لەگەڵ فەرەنگیسا هێنایەوە بۆ ئێران ۰

( ل )

لور :

خەڵکێکی زیاتر دەوارنشینن لە کوێستانەکانی باشووری ڕۆژاوای ئێران ئەژین ۰ مەسعوودیی مێژوونووس [سەدەی دەهەم] ناوی لە لیستەی هۆزە کوردەکانا هێناون ۰ هەروا یاقووتی حەمەویی گەڕاڵ [سەدەی سیانزەهەم] وایان ناوئەبا کە «خێڵێکی کوردن لە کوێستانەکانی نێوان خوزستانو ئەسفەهان ئەژینو ، وڵاتەکەیان ناوی (لورستان)ە» ۰ مەڵبەندی شارستانی لورستانی ئێستا شاری (خوڕڕەمئاباد)ە ۰

لەک :

خێڵێکی کوردو بەشێکن لە لوڕ لە ناوچەکانی کرماشانو هەمەدانو ئەسفەهانو کوردستانو چەند ناوچەیەکی‌تری ڕۆژاوای ئێران ئەژین ۰

لەنگەر بۆ ڕاگرتن :

کینایەیە لە پشت‌گرتنو پارێزگاری‌لی‌کردن ۰

( م )

مازوان‌بەند :

کێوێکە لەپشت کێوی (ئاربەبا)ی بانەوە ۰

**مۆتەکە :**

قورسایی‌یەکە لەخەوا ئەکەوێتە سەر سنگی مرۆی نووستوو ، ناتوانێ جووڵەو هاوار بکا تا تەواو بێدار ئەبێتەوە .

**موناقەشەکردن :**

ئەهێشتن .

**موساحەبە :**

هاورێیەتی . لەگەڵژیان .

**موعاشەرەت :**

هاورێیەتی‌و پێکەوە ژیان . لەم کتێبەدا بە مانای ژیانی پێکەوەی ژن‌و مێردە .

**موغایر :**

هەرکام لە دوو ڕووی هەر شتێ بە بەراورد لەگەڵ ئەویان بەمەرجێ نەکرێ هەردوکیان پێکەوە کۆببنەوە لەو شتەدا .

**مولاقات :**

بەیەك‌گەیشتن .

**مەحسوولی حەیات :**

بەرهەمی ژیان . مەبەست منالە .

**مەخمەل :**

جۆرە قەیفەیەکە .

**مەرنەمووکە :**

لە بنەڕەتا بە فریشتەی پرسیارلێ‌کردنی مردوو لە گۆڕا ـ ئەوترێ ، بووە بە کینایە لە پیرەژنی زۆر ناشیرین . لە ڕستەی (من ربك ؟) ەوە هاتووە کە یەکێکە لە پرسیارەکانی ناو گۆڕ .

مەسلەك :

ڕەوشــــت •

**مەلائەحمەدی چاومار :**

بوون سەرەمحموودی دیلێژەیی پیرحەسەنییە • لەبەر جوانیو ڕۆشنیی چاوی ، لەناو خەڵکا ، بــە (چاومــار) ناووبانگــی دەرکردووە • لە دەوروبەری ۱۲۰۰ی ك • (۱۷۸۵ ـ ۱۷۸٦ی ز•)دا لەدایك بــووە • لای باوکــی و لای مــەلاعەبــدوڵڵای ڕەش خوێندوویەو ، لای شێخ مەعرووفی نۆدێ ئیجـازەی مەلایەتیـی وەرگرتووەو ، لە مزگەوتی بنەماڵەی خۆیان [مزگەوتـی مفتـی] دەستی کـردووە بە دەرزبێژوتنـی فەقێیـان • ئەمنەخانـی کچـی سلێمان پاشای بابانو خوشکـی ئەحمەدپاشـای هێنـاوەو ، مـەلا موحەممەدئەمینی کوڕی کە پاش خۆی بووە بە مفتیی سلیمانی لەم ئەمنەخانەیە • لە بەڵگەیەکی دەسنووسا کە لای کاك جەمال مفتي پارێزراوەو ئەگەڕێتەوە بـۆ ۱۲۳۰ی ك • (۱۸۱٤ ـ ۱۸۱٥ی ز •) ناوی بە گەورەی دەرزبێـژان ( کبیـر المدرسیـن) هاتووە • لـە ۱۲۷۹ی ك• (۱۸٦۲ ـ ۱۸٦۳ی ز•)دا کراوە بە مفتیی سلێمانیو ، لە ۱۲۸۸ی ك • (۱۸۷۱ ـ ۱۸۷۲ی ز•)دا چووە بۆ حەجو لـەوێ لە گەردەلوولێکی توندی باو تۆزی ڕێگای بیاباندا کەوتووەتـە ناو لەو خنکاوەو بەوە کۆچی دوایی کردووەو ، هـەر لە خاکـی حیجاز بەخاك سپێرراوە •

**مەوقیع :**

شوێن • پایەو پلە •

**میچلان :**

فێڵ لێ کردنو هەڵخەڵەتاندن • شوێنی میچی یاری • میچ ئێستاتێکە لە قاچی ئاژەڵا منداڵان یاری یەکی تایبەتیی پێ ئەکەن •

**میراودەلی :**

بنەماڵەیەکن ئەچنەوە سەر عەشایری موکري • سەرەکی عەشایری پژدەرن لە ناوچەکانی قەڵادزەو مەرگەو ماوەت •

**میرزابەگ :**

کوری موحەممەدبەگ ، یەکێکە لە میرەکانی بنەماڵەی ئیختیارەددینیی حوکمرانی بانەو ، زاوای بێگەبەگی ئەردەڵان بووە •

( ن )

**ناخواه :**

ناحەز •

**نادانی :**

نەزانی • نەفامی •

**ناگەهانی :**

لەپڕ •

**نیگەهداری :**

ئاگاداری لێکردن • ڕاگرتن •

( و )

**وەلەدبەگی :**

لقێکن لە عەشرەتی جاف لە کوردستانی ئێران دائەنیشن •

( ھ )

**ھومایوون :**

پیرۆز • مەبەست پادشایە •

**هۆمەرنیسك :**

پارچە مولکێکی ئاغایانی شیوەکەڵ بووە ، ومختی خۆی گوندێکیش هەر بەو ناوە لەسەر ئەو پارچە مولکە بووە ، لەو پارچە مولکەدا ماش و نیسکی باش هێتراوەتە بەرهەم .

**هەرگا :**

هەرکاتێ .

**هەڕووتە :**

شاخێکە لە بەردەم چیای ئەزمڕدا بە دیوی سلێمانییەوە .

**هەلکرد :**

گوزەرانو ڕابواردن .

**هەمحودوود :**

ناوی دوو شوێن سنووریان بەیەکەوە بێ ، دوو کۆمەڵە خەڵك نشینیان لەپاڵ یەکا بێ .

**هەمسەر :**

هاوسەر ، ژن بۆ مێردو مێرد بۆ ژن .

**هەیئەت :**

دەستە ، کۆمەڵە ، لیژنە ، ئەنجومەن .

( ی )

**یەکبوجوود :**

یەکبوون ، بە یەك شت بوونی دوو شت یا زیاتر .

## سەرچاوەکانی ئەم ڕابەرە


١ ـ التعريف بمساجد السليمانية ومدارسها الدينية ، محمد القزلجي ، مطبعة النجاح ، بغداد ، ١٩٣٨ ٠

٢ ـ المنجد في اللغة والاعلام ، إصدار المطبعة الكاثوليكية في بيروت، الطبعة السابعة والعشرون ، بيروت ، ١٩٨٤ ٠

٣ ـ بنەماڵەی زانیاران ، مەلا عبدالکریمی مدرس ، بەغدا ، چاپخانەی شەفیق ، ١٩٨٤ ٠

٤ ـ تاريخ الدول والامارات الكردية في العهد الاسلامي ، محمد أمين زكي ، ترجمة محمد علي عوني ، مطبعة السعادة بمصر ، ١٩٤٥ ٠

٥ ـ تەئریخی سلێمانی‌و ولاتی ، موحەممەدئەمین زەکي ، بەغدا ، ١٩٣٩ ٠

٦ ـ خلاصة تاريخ الكرد وكردستان ، محمد أمين زكي ، ترجمة محمد علي عوني ، مطبعة السعادة بمصر ، ١٩٣٦ ٠

٧ ـ علماؤنا في خدمة العلم والدين ، عبدالكريم محمد المدرس ، دار الحرية للطباعة ، بغداد ، ١٩٨٣ ٠

٨ ـ فرهنگ فارسي ، دكتر محمد معين ( شش جلد ) ، مؤسسه انتشارات امير كبير ، تهران ، ١٣٦٠ ٠

٩ ـ فرهنگ لرى ، حميد ايزد پناه ، چاپ دوم ، پايز ١٣٦٣ ، (ايران) ٠

١٠ـ فرهنگ لكى ، حميد ايزد پناه ، چاپ اول ، ١٣٦٧ ، (ايران) ٠

١١ـ فەرهەنگی ئەنسیکلۆپێدیایي ، دانانی لیژنەیەك ، بەرگی یەکەم، ئەنقەرە، ( بێ ساڵی لەچاپدان ) ، ( بە زمانی تورکي‌و پیتی لاتیني ) .

١٢ـ فەرهەنگی خاڵ ، شێخ موحەممەدی خاڵ ( سێ بەرگ ) ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ١٩٦٤ ، ١٩٧٤ ٠

١٣ــ فەرهەنگی نیگارینی تورکی ، کۆڕی زمانەوانانی تــورك ، چــاپخانــەی کۆمەڵەی مێژوونووسانی تورك ، ئەنقەرە ، ١٩٧٧ ( بە زمانی تورکیو بە تیپی لاتینی ) .

١٤ــ قاموس ترکي ، شمس‌الدین سامي ، استانبول ، اقدام مطبعه‌ســي ، ١٣١٧ ، ( بە زمانی تورکیو بە تیپی عەرەبی ) .

١٥ــ گۆڤاری کاروان ، ژمارە ١٩ ، نیـــسانی ١٩٨٤ ، محمد الملا عبدالکریم ، « عود علــی بدء فـي الرســائل البابانيــة واوراق قديمــة أخـــرى » ، ل ١٤٣ ــ ١٤٨ .

١٦ــ لغتنامە ، علی‌اکبر دهخدا ، بەرگی تیپی (ر) ، ( بە فارسـي ) .

١٧ــ مذكرات مأمون‌بك بن بيگەبك ، نقلها الى العربية وعلق عليها محمد جميل الروژبياني وشكور مصطفى ، مطبعة المجمع العلمي العــراقي ، بغــداد ، ١٩٨٠ .

١٨ــ مێژووی ئەدەبی کورد ، علاءالدین سجادي ، چاپی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٥٢ .

١٩ــ مێژووی ئەردەڵان ، مەستوورەی کوردستانی ، د. حەسـەن جاف و شوکور مستەفا کردوویانە بە کوردی . چاپی یەکەم ، چاپخانەکانی دار الحرية ، بەغدا ، ١٩٨٩ .

٢٠ــ هەنبانە بۆرینە ( فرهنگ کردی ــ فارسی ) ، هەژار ، بەرگی یــەکــەم ، ( ئـ ) تــا ( س ) ، تهران ، ١٣٦٨ .

٢١ــ هەندێ بەڵگەنامەی دەسنووسی ناو کتێبخانەی تایبەتیی کاك جەمــال مفتیو کاك عەبدورەقیب یوسف .

# تێبینی

« بۆ هەموو ئەوانەی بەتەنگ چۆنیەتیی نووسینی کوردییەوەن.»

هەموومان ئاگاداری ئەوەین کە گیروگرفتی نەبوونی دوو شێوەی جیا بۆ نووسینی تیپی (ی)ی درێژ وەك لە وشەی ( پیاوەتی ، کوردایەتی ، ئازایەتی ) و (ی) کورت وەك لە نیمچە ڕستەی (کوردی عێراق ، کوڕی باوکم . قاقەزی زەرد )دا ، چەند گیروگرفت بۆ خوانا پەیدا ئەکا ، بەتایبەتی ئەوانەی لە بەردەمی خەلکدا یا لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنەوە بابەتێ ئەخوێننەوەو گەلێ جار پێ‌نازانن (ی)ی درێژ بە شێوەی (ی)ی کورت ئەخوێننەوە .

من دەمێ ساڵە هەستم بەم گیروگرفتە کردووەو . لەئەنجامی لێوردبوونەوەیەوە ، بۆ چارەسەرکردنی ئەوەم بەبیراهاتووە (ی)ی درێژ کە بکەوێتەداوێنی وشەوە بە دانانی دوو نوختە لەژێریا لە (ی)ی کورت جوێ‌بکەینەوە کە هیچی لەژێرەوە دانەنێین .

لە بەشی سێهەمی ئەم کتێبەدا کە ڕابەری لێکدانەوەی وشەو ناوەکانی ناو کتێبەکەیە ئەم بۆچوونەی خۆمم بەسەرکردووەتەوەو جێ‌بەجێم کردووە، هیوام ئەوەیە خوانایانی ئازیز لێی بکۆڵنەوەو هەڵیسەنگێنن‌و لەم‌ڕووەوە بیرو بۆچوونی خۆیان لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان دەرببڕن ، تا ئەگەر دەرکەوت بۆچوونێکی بەجێیە پەسەند بکرێ‌و هەموان لەسەری بڕۆین .

ئیتر خۆشیتان .

**محمدی مەلاکریم**

## لــه بەرهەمەکانی دانەر :

★ پیلانێك لە زدی گەلی چین [ وەرگێڕان لە عەرەبی‌یەوە ] ، کەرکووك ، ١٩٥٨ .

★ حاجی‌قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد ، بەغــدا ، ١٩٦٠ .

★ چارەی ڕاستی ناکۆکیی ناو ڕیزەکانی گەل [ وەرگێڕان لە عەرەبی‌یەوە ] ، ســلێمانی ، ١٩٦٠ .

★ «کوردایەتی»ی کامیل ژیر لەژێر نەشتەری یەکالاکردنەوەدا ، بەغدا ، ١٩٦١ .

★ موجز تاریخ امراء سوران [وەرگێڕان لە کوردی‌یەوە] ، بەغدا، ١٩٦٧ .

★ کۆمەڵێك لاوكو حەیران ، بەغدا ، ١٩٦٨ .

★ ضوء علی الوضع في ایران [ وەرگێڕان لە فارسی‌یەوە ] بەغدا ، ١٩٦٩.

★ دیوانی بێخود ، بەغدا ، ١٩٧٠ .

★ جەنگاوەرێکی ڤێتنامی [ وەرگێڕان لە عەرەبی‌یەوە ] ، بەغدا ، ١٩٧٠ .

★ چمکێکی مێژووی هەورامانو مەریوان [ هەڵبژاردنو وەرگێــڕان لــە فارســی‌یەوە ] ، بەغــدا ، ١٩٧٠ .

★ لێنینی مەزن [ وەرگێڕانو ئامادەکردن لە عەرەبی‌یەوە ] ، بەغدا ١٩٧٠ .

★ دیوانی بێکەس ، بەغدا ، چاپی یەکەم ، ١٩٧٠ ؛ چاپی دووەم [ بە زیادەو پێشــەکی‌یەکی تێرو تەسەلەوە ] ، ١٩٨٠ ؛ چاپی سێهەم ، ١٩٨٥ .

★ هەندێ لای ئەودیوەکەی بیری ڤانیـع ، بەغدا ، ١٩٧٢ .

★ شۆڕشی ١٩٠٥ ــ ١٩٠٧ ڕێی بۆ شۆڕشی مەزنی ئۆکتۆبەر خــۆش‌کر [ وەرگێڕان لە عەرەبی‌یەوە ] ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

★ شیرین‌و خوسرەوی خانای قوبادی ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

★ لە ماڵ‌و لە قوتابخانەدا [ وەرگێران لە عەرەبی‌یەوە ] ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

★ کردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی [وەرگێران لە کوردی‌یەوە] ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

★ دیوانی مەحوی [ بە هاوکاری لەگەڵ باوکم ] ، بەغدا ، چاپی یەکەم ، ١٩٧٧ ، چاپی دووەم ، ١٩٨٤ .

★ نالی لە کلاورۆژنەی شیعرەکانیەوە ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

★ لە ڕێگای ئەدەب‌و لەپێناوی نالیدا ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

★ بەرەو سایکۆلۆژیی بزووتنەوەی کرێکاران [ وەرگێران لە عەرەبی‌یەوە ، لە چوارچێوەی کتێبی «دوژمنان»دا] ، بەغدا ، ١٩٨١ .

★ پووشکین [ وەرگێران لە عەرەبی‌یەوە ] ، بەغدا ، ١٩٨٣ .

★ یادداشتەکانی منالی‌و بەشێکی سەردەمی فەقێ‌یەتیی مامۆستا مەلا محمدی چروستانی ، بەغدا ، ١٩٨٤ .

★ گەنجینەی مەردان‌و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری (ی مەلا عەبدوللای زێوەر ) ، بەغدا ، ١٩٨٥ .

★ هەنگاوێکی‌تر بە ڕێگادا بەرەو ساغکردنەوەی دیوانی حاجی‌قادری کۆیی، بەغدا ، ١٩٨٩ .

★ بەتەمای دەمەتەقێ‌یەکی دۆستانەو دیموکراتی بووم ، بووم بە « کاکە حەمەی کورد » ، بەغدا ١٩٩٠ .

★ یەکێتیی سۆڤیەت بەرەو کوێ وا مل‌ئەنێ ؟ بەغدا ، ١٩٩١ .

لەگەڵ بەشداری‌کردن لەگەڵ چەند کەسی‌تر لە نووسینی بەشەکانی هەندێ کتێب‌و ، لە وەرگێرانی چەند کتێبێکی قوتابخانەو ، پیاچوونەوەو دارشتنەوەو پەراوێز بۆنووسینی چەند کتێبی‌ترو ، بڵاوکردنەوەی دەیان وتاری ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕەخنەیی لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی‌و عەرەبی‌یەکانی عێراق‌و سووریاو لوبناندا .

٨٩٢٫٧٣٠٧

م ٣٨٤ محمدی مەلاكريم

بیری كۆمەڵایەتیو سیاسیپیرەمێرد لە كەلێنی ..

((بیٖبەسی تەمسیلێکی ڕاستیتەئریخیەوە))لەوڵاتی خۆماندا ڕوویداوە بەلەگەل تێکستی پیٖبەسی تەمسیلێکی ڕاستی تەئریخی لە وڵاتی خۆماندا ڕوویداوە لە نووسینی پیرەمێرد ؛ ساغکردنەوەو پەراویز بۆکردنو رابەربۆتورسینیمحمدی مەلا کریم ...بەغدا : دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردي ، ١٩٩٢ .

ل ؛ ٢٤٫٠ سم . ـ ( زنجیرەی کتێبی ژمارە ؛ ٢٨٤ )

١ـ هێرۆکی کوردی (پیرەمێرد) ـ لێکۆلینەوەی کۆمەڵایەتیو سیاسي ٢ـ القصة الكردية

م . و (پیرەمێرد) ـ دراسة سياسية واجتماعية ا ـ پیرەمێرد ب ـ ناونیشان ج ـ زنجیرە

٩٩٢/٥٩٤

کتێبخانەی نیشتمانی ( پێرستکاری لە بلاوکردنەوەدا )

رقم الايداع في دار الكتب والوثائق
بغداد ٥٩٤ لسنة ١٩٩٢

دار الحرية للطباعة ـ بغداد
١٤١٣هـ ـ ١٩٩٢م